

د. شوكریە رەسوڵ

# تەكنیكی گێڕانەوە

# لە چیرۆكەكانی (مارف بەرزنجی)دا

٢٠٠٥




د. شوكريه ڕەسول

# تەکنیکی گێڕانەوە

# لە چیرۆکەکانی (مارف بەرزنجی)دا

2005

* ناوی کتێب: تەکنیکی گێڕانەوە لە چیرۆکەکانی (مارف بەرزنجی)دا
* بابەت: لێکۆڵینەوە
* نووسینی: د. شوکریە ڕەسول
* لە بڵاوکراوەکانی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کورد- 12
* دەرهێنانی ناوەڕۆك و بەرگ: فەهد شوانی
* چاپی یەکەم - ٢٠٠٥
ژمارەی سپاردن (٢٩٨) ساڵی ٢٠٠٥ز
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر

پێشەکی:

ئەگەر بە وردی بڕوانینە هونەری چیرۆکی کوردی تا دەیەی حەفتاکان دەبینین لێکۆڵینەوە لە زۆربەی چیرۆکنووسان و لایەنە هونەرییەکانی چیرۆکەکەکان کراوە... بەدەگمەن لە ناو ئەمانەدا ئاوڕ لە چیرۆك و بەرهەمەکانی (مارف بەرزنجی) شەهید-پشکۆ-نەدراوەتەوە... هەر بۆیە وەك پێویستی ئەم بابەتە ئاوڕمان لەلایەنێك لە تەکنیکی چیرۆکەکانی داوەتەوە ئەویش (تەکنیکی گێڕانەوە)یە.

هەڵبژاردنی ئەم بابەتە لەبەر دوو هۆ بووە ئەویش:

١- زیندووکردنەوەو ئاوڕدانەوە لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجی و تەکنیکی گێڕانەوە.

٢- تاکوو ئێستا هیچ نووسەرێك ئاوڕی لە بەرهەکان و شوێنی مارف بەرزنجی وەك شاعیرو چیرۆکنووس نەداوەتەوە لە کاتێکدا کە سەرجەم بەرهەمەکەی بە پوختەکراوی لەساڵی ١٩٩٣ لەلایەن سامان مارف بەرزنجی و (عومەر مەعروف بەرزنجی) ساغ کراوەتەوە.

## ناوەڕۆك:

- مۆنۆلۆگی ناوەوەی راستەوخۆ
- مۆنۆلۆگی ناوەوەی نا راستەوخۆ
- مۆنۆلۆگی تەداعی
- شەپۆلی هۆش

باسی دووەم: هەندێ تەکنیکی تری گێڕانەوە.

١- چاپتەرکردنی چیرۆك.

٢- هەواڵی رادیۆیی.

٣- گەڕانەوە بۆ رابردوو هێنانە پێش چاو.

٤- تەکنیکی یەك دەنگی (مۆنۆفۆنی).

٥- تەکنیکی فرە دەنگی (پۆلیفۆنی).

بۆ هەر یەکێك لەم تەوەرو باسانە بەپێی لایەنی نەزەری و پراکتیکی چیرۆکەکانمان پراکتیزە کردووە.

لە کۆتاییدا بە ئەنجام و خستنەڕووی سەرچاوەکان کۆتاییمان بە باسەکە هێناوە.

## تەوەری یەکەم:

### باسی یەکەم:

### (کورتەیەك لەژیان و بەرهەمی رۆشنبیری مارف بەرزنجی)

باشترین سەرچاوە کە گەلێ راستیمان بۆ روون دەکاتەوە (ژیان نامە)ی مارف بەرزنجی خۆیەتی کە بە دەست خەتی خۆی مێژووی ژیانی لە گرتووخانەی بەغدا لە سالەکانی ١٩٦٠-١٩٦١ نووسیوەتەوە(*) ئێمە هەندێ لایەنی بە کورتی لێی دەدوێین.

- مارف بەرزنجی کوری شێخ عدبدولکەریمی کوری برا گەورەی شێخ حەسەنە کە بە (شێخ حسێن)ی شەهید ناو ئەبرێت. لە ناحیەی قادر کەرەم سالی (١٩٢١) لە دایك بووە... هەر لە مندالییەوە دایکی دەمرێ و لای باوك و باوەژن گەورە دەبێ و برینی بێ دایکی لە دەروونیا سارێژ نابێ تا ئەو کاتەی یاداشتی خۆی نووسیوە، بە وردی ئەمەی روون کردۆتەوە.

(*) مارف بەرزنجی ژیاننامەی خۆی بۆ د. مارف خەزنەدار بۆ مۆسکۆ ناردووەو ئەویش پاش گەرانەوەی بە سێ زنجیرە لە ژمارەکانی ٢- ٣ی دەفتەری کوردەواریێ سالی ١٩٧٠و ژمارە ٤١ی رۆژی کوردستان سالی ١٩٧٦ بلاوکردۆتەوە (بروانە سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید - کۆکردنەوەو رێکخستنی- سامان بەرزنجی و عومەر مارف بەرزنجی- هەولێر ١٩٩٣ز ل ٤٣.

- مارف بەرزنجی هەر لە منداڵییەوە تا گەورەبوونی لە ناو کێشەو ململانێدا بووە بە چاوی خۆی چەوسانەوەی کوردو بنەماڵەکەیان بە دەست ئینگلیزو رژێمی پاشایەتی بینیوە کە گەورەش بوو ئەم گێرمەو کێشەو گرتن و بردنی، چووە ناو کۆڕی سیاسەت و هەر لە ساڵانی چلەوە تا لە سێدارەدانی لە زۆربەی خۆپیشاندانەکاندا لە ریزی پێشەوە بووەو دژی رژێمی پاشایەتی خەباتی کردووە.

ساڵانی (١٩٤٤- ١٩٤٥) کە لە کۆلیجی (حقوق) دەبێ چالاکییەکی چاکی لە بواری سیاسەتدا نواندووە.. لە ساڵی (١٩٤٨) کە کۆلیجی (حقوق)ی تەواو کرد، لە کەرکووك دەبێ بە پارێزەرو ئیتر سیاسەت و نەبوونی و نەداری تووشی گەلێ گێرمەو کێشەی دەکات بە تایبەتی باوەڕی ئاشتی خوازانەو پاڵپشتی چینی کرێکارو جووتیار هێندەی تر ورەی بەرز کردبوو، بە زۆریش لە کارەکەیدا (دەعوای) جووتیارانی وەردەگرت.. مارف بەرزنجی بە هۆی سیاسەتەوە چەندین جار دەگیرێ و تووشی گرتووخانە دەبێ و پاش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ بوو بە سکرتێری ئاشتی خوازانی کەرکووك و ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی و سەرۆکی شارەوانی کەرکووك.. پاش مانگ و نیوێك بە هۆی (فیتنەی کەرکووك) گیرایەوەو لە رۆژی یەکەم ئاهەنگی جەژنی ساڵانەی شۆڕشی

١٤ی گەلاوێــژی ١٩٥٩دا بــەماددەی (٨٠)ی قــانوونی عقوبــاتی بەغـدا درا بـە عـورفی کـە سـزاکەی خنکانـدن بـوو. (گوایــە ئـەو سەرۆکی هەڵگیرساندنی ئەم کارە بووە)[1].

لــە رۆژی ١٩٦٣/٦/٢٣دا دوای چــوار ســاڵ زینــدانی لەگــەڵ براکەی شێخ حوسێن و دەستەیەك لە هاوەڵەکانی لە کەرکووك لەلایــەن رژێمــی بەعــسەوە تــەنفیزی لــە ســێدارەدانی دەدرێ و شەهید دەکرێ.

وەسیەتنامەیەکی کورت و چڕی بە زمانی عەرەبی بۆ خێزان و دۆست و خزم و منداڵەکانی دەنێرێ[2].

جوانترین وتەی ئەوە بوو (ئێمە ئەگەر گوڵیش نەبین ئەبین بە گڵ بۆ گوڵ).

[1] سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید... ل ٥٤.

[2] هەمان سەرچاوە...... ل ٤٢٩.

## مارف بەرزنجی و بەرهەمەکانی

مارف بەرزنجی وەك سیاسەتمەدارێك دەوری خۆی لە بواری کۆمەڵایەتی بینیوەو ئەنجامەکەشی قوربانیدانی بووە لەو خەباتە درێژخایەنەدا.. سەرباری ئەم لایەنە لە بواری رۆشنبیریدا ناوبراو وەك ئەدیبێك خاوەن داهێنانی هزری بووە چ لە بواری شیعر دانانیدا چ لەبواری چیرۆکنووسین و وەرگێڕاندا دەوری بینیووە.. مارف بەرزنجی هەر لەسالانی چلەوە هەوڵی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی داوە، بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٤٢دا بە هاریکاری (شاکر فەتاح) لە ناحیەی قادر کەرەم توانی رۆژنامەیەکی هەفتانە بە ناوی (باسەرە) دەربکەن لەو رۆژنامەیەدا مارف بەرزنجی بەرهەمی بە نازناوی (ناسراو) یان (بەرزنجی) بڵاوکردۆتەوە (دەتوانین رۆژگاری تەقینەوەی کانیاوی روونی شیعری بڵاوکراوەی مارف بەرزنجی ببەستینەوە) بە کات و سەردەمی دەرچوونی گۆڤارە سەنگینەکانی وەك (هیوا- شەفەق- روناهی)و دواتریش رۆژنامەی (ئازادی) کە وەك شاعیرێکی ناسراوە دەرکەوتوو بە نازناوی (پشکۆ)وە هاتە کۆڕی شیعری راستەقینەوە[٣] لە بواری چیرۆکنووسیشدا هەوڵ و کۆششی بۆ

[٣] هەمان سەرچاوە...... ل ١١- ١٢.

ناوەڕاستی پەنجاکان دەگەڕێتەوە. هەروەها بەدەرچوونی گۆڤاری (شەفەق) لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨دا دەروازەیەکی رووناکتری بۆ کراوەتەوە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی و خۆ خەریککردنی سەرومڕ بۆ ئەم هونەرە کە خاوەنی شێوازێکی تایبەتی بووە[٤] مارف بەرزنجی سەرباری ئەم لایەنە دەستێکی باڵای لە بواری رەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی هەبووە کە رەخنەی لە بەرهەمی شیعری (کامەران موکری) گرتووە لەگەڵ کتێبەکەی عەبدولرەزاق بیمار (شانۆی کوردستان)و (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) کە هەژار بە شێوەی موکریانی کردوویە بە شیعر. هەروەها لە هونەری وەرگێڕانیشدا دەستێکی باڵای لە وەرگێڕانی شیعرو هونەری چیرۆك... هەبووە. سەرباری ئەم چالاکیانە لە بواری رۆژنامەگەرێتیدا دەستێکی باڵای هەبووە. بە تایبەتی لە گۆڤاری (شەفەق)دا وەك نووسەرێکی شارەزاو بە توانا بەرهەمەکانی تیا بڵاوکردۆتەوە، بەگشتی سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی بریتین لە: (شیعر، وتار، چیرۆك، شانۆگەری، نامەی تایبەت، وەرگێڕان، وردە بابەت). شایەنی باسە شەهید مارف بەرزنجی لە بواری نووسیندا ئەم نازناوانەی بەکارهێناوە (ناسراو، بەرزنجی، پشکۆ، شوان)و هەندێ

[٤] هەمان سەرچاوە...... ل١٨

نووسینی تری بە ناوی خۆیەوە بڵاوکردۆتەوە.. لە گۆڤاری (شەفەق)دا وەك هەر ئەدیبێکی ناسراو گۆشەیەکی بەناوی (ئەلف با) هەبووەو وتاری سیاسی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بەناوی (شوان) بڵاوکردۆتەوە. بەم هۆیە مارف بەرزنجی شەهید وەك نووسەرو ئەدیب و پێشکەوتنخوازێك و وەك سیاسەتمەدارێکی کورد دەورێکی گەورەی لە بواری فیکری و ئەدەبی و هونەریدا بینیوە تا شەهید کردنی دەست بەردانی قەڵەمەکەی لە پێناو خزمەتکردن بەرنەداوە.

باسی دووەم:

## شوێنی مارف بەرزنجی و
## تەکنیکی چیرۆکنووسین لە ناو چیرۆکنووسانی سالآنی پەنجاکاندا

- چیرۆکی کوردی لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا وەك هونەرێك چەند هەنگاوێکی پێشکەوتووانەی نا بە تایبەتی بەدەرکەوتنی هەندێ گۆڤاری خزمەتگوزاری وەك (پێشکەوتن- شەفەق- هیوا) کە دەرگایەکی رۆشنبیرییان خستە سەر پشت بۆ نووسەران و پشتگیرییان لە رێگای بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان[1] بەڵێ چیرۆکەکانی ئەو سەردەمە رەنگدانەوەی باری سیاسی و کۆمەلآیەتی کورد بوون... لەو سالآنەدا تا شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ جووتیارانی کورد رووبەڕووی دەرەبەگەکان و رژێمی پادشایی راپەڕینی قوتابیان راپەڕینیان کرد، حیزب و دەستەو نیشتمانپەروەران لە راپەڕینەکاندا رۆڵی شیاوی خۆیان بینی... دەرگای گرتووخانەکان کرانەوە... بەرەی نیشتمانی بەرەیەکی یەکگرتوو بوو بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ئەم بارە سیاسی و مێژوو و کۆمەلآیەتییە لە بەرهەمی

[1] لێکۆڵینەوەی بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی -عومەر مەعروف بەرزنجی. بەغدا ١٩٧٨. ل ٥٧- ٧٦.

چیرۆکنووسـانی ئـەو قۆناغـە بـەزەقی رەنگـی داوەتـەوە.
چیرۆکنووسانی ئەو سەردەمەش بە گشتی لە بەرەی گەل بوون.
بە چەکی وشە پەردەیان لە رووی رەشی رژێمی کۆنە پەرست هەڵداوەتەوە[٢] یەکێك لەو چیرۆکنووسانەی ئەو سەردەمە کە تەوەرەی باسەکەکانی گرتۆتەوە چیرۆکنووس مارف بەرزنجی شەهیدە کە چیرۆکەکانی رەنگدانەوەی واقعی کۆمەڵەکەی بووەو دەوری نووسەر لە وشیارکردنەوەو رەخساندنی زەمینەیەکی دیموکراسیدا دەبینی و لەلایەکی ترەوە توانای بۆ چیرۆکنووسین و دارشتنەوەی دەردەکانی کۆمەڵایەتی و دەوری دەرەبەگ و ئاغا لە چەوساندنەوەی گوندەکاندا دەخستەڕوو.

بەڵێ مارف بەرزنجی لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا دەستەی سێیەمی چیرۆکنووسانی کورد پێك دەهێنێ لە هەموویان ناسراوتریش (محەرەم ئەمین و محەمەد مەولود (مەم) دوکتۆر جەمال نەبەزو جەلال مەحمود عەلی و جەمال بابان و ئەمین میرزا کەریم و مارف بەرزنجی)یە سەرەتای خۆخەریککردنی مارف بەرزنجی بە چیرۆکی هونەرییەوە، هەوڵ و کۆششی بەردەوامی لەم بوارەدا بۆ ناوەڕاستی پەنجاکانی ئەم سەدەیە دەگەڕێتەوە...
ئەم چیرۆکنووسە لە بەرهەمەکانیدا خاوەن شێوازێکی تایبەتییەو

[٢]) چیرۆکی هونەری کوردی –حسێن عارف... ل ١٠٠.

بڕوایـەکی سـەرومڕی بـە ڕێبـازی ریالیـستی هـەبووەو کەرەسـتەو نــاوەڕۆکی بابــەتاکانی لــە بەســەرهات و ڕووداوی خۆمــاڵی هەڵهێنجاوە[٣]

[٣]) بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید..... ل ١٨.

## تاقی کردنەوەی چیرۆکنووسین لای -مارف بەرزنجی-

تاقیکردنەوەی چیرۆکنووسی مارف بەرزنجی بە هۆی گۆڤاری (شەفەق)ەوە زیاتر نووسەر ناسرا وەك خۆی دەڵێ (بەهۆی گۆڤاری (شەفەق)ەوە ماوەی ئەوەم بوو کە زۆرتر خوو بدەمە نووسین لە سەرەتاوە مامۆستا عەبدولسەمەد خانەقاو کەمێك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد یارمەتیاندام بەتایبەتی لە نووسینی چیرۆکی (ئاوازو کەباب*)دا کە لە شەفەقدا بڵاوکرایەوە... پاش ئەوە دەستم کرد بە خوێندنەوە لەسەر فەنی چیرۆکنووسین چیم دەست کەوت لەسەر چیرۆك خوێندنمەوە.. زۆر کەڵکم لە کتێبەکانی دکتۆر محەمەد یوسف نەجم (فن القصه)و (القصه فی الادب العربی)و کتێبەکەی دوکتۆر رەشاد روشدی (فن القصه القصیره)و کتێبە نایابەکەی لاگوس پاگری کە (دووریـنی خەشەبە) کردوویەتی بە عەرەبی (فن الکتابە المسرحیه)م وەرگرتووە چیشم دەست رۆیشتبێ لە خوێندنەوەی چیرۆك درێخیم نەکردووە[١].

* چیرۆکی ئاوازو کەباب لە ژ ٢ی شوباتی ١٩٥٨ی گۆڤاری (شەفەق) بڵاوکراوەتەوە.

(١) بروانە سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی.... ل ٥٦- ٥٧.

– بەم چەشنە مارف بەرزنجی لە تاقیکردنەوەی چیرۆکنووسین و بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکانی دەدوێ.. لە تازەکردنەوەی شێوازی تەکنیکی نوێ و سوود وەرگرتنی لە ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی ئەوروپی دەدوێ. وێنەی نوێ لە چیرۆکەکاندا دەنەخشان و موعادەلەیەکی رەمزی چیرۆکی (شەتڵ) بۆ کۆمارە ساواکەی ١٤ی گەلاوێژو ئامانج و هیواو رێکخراوە دیموکراسیکانی وەك شەتڵ و نەمام سەریان دەرهێنا لەگەڵ قوتابییەکانی تردا وەك شەتڵ وابوون). چیرۆکنووس لە چیرۆکەکانیدا خەیاڵکاری تیا کردووە نە خەیاڵی روون بەڵکو کەرەسەو رووداو لە واقع وەرگرتن و خەیاڵکاری تیا کردن تا لە رووداوێك جەوهەرێکی شاراوە دەربخەین و مەغزایەکی لێ وەرگرین وەك لە چیرۆکی (جەژنێکی شادی*)دا خەیاڵکاری تیا بەکارهێناوە (هەژاران زوو نامرن... نامرن...)[2].

– مارف بەرزنجی لە هونەری چیرۆکدا پیتێکی باڵای بووە باشترین بەڵگە ئەو وتارەیە بە ناوی (تیشکێك سەبارەت بە هونەری چیرۆکنووسین) کە سەرچاوەی باسەکە لە چەندین چیرۆکنووسانی عەرەبەوە وەرگرتووەو شارەزایی خۆی لەو

* لە ژ ٣٣ی تەمووزی ١٩٦١ی گۆڤاری هیوا بڵاوکراوەتەوە.

[2] هەمان سەرچاوە. ل ٥٧– ٥٨.

بوارەدا دەرخستووە بەوەی ئەو سەرنجانەی دەربارەی تەکنیکی چیرۆك باس دەکات وەك (چیرۆك گێرانەوەی ڕووداوە)، (ڕووداوەکانیش لە کەسەوەیەو ئەو کەسانە یەك جۆر نین، شوێن و بەستنی کەسەکانی چیرۆك وەك یەك نابن، لەلایەکی ترەوە نووسەر ڕامان دەکێشێ بۆ دەرەوەی چیرۆکنووسی سەرکەوتوو.

(چیرۆکنووسی هونەرمەند ڕامان ئەکێشێ لەگەڵ ڕووداوەکانیا.. ئەمەش چیرۆکنووس بەوە پێ دەگا کە لە ڕاستی ژینی کۆمەلآیەتی دوور نەکەوێتەوەو ئەبێ چیرۆکنووس دەروون ناس بێ مەبەستم لە زانستی سایکۆلۆژیدا ئەبێ شارەزا بێ... لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ چیرۆکنووس کارێکی وای کردبێ لە چنین و هۆنینەوەی ڕووداوەکانی چیرۆکەکەیا باوەڕی پێ بکەن کە ئەو ڕووداوانە ڕاستن یا دوور نین لە ڕاست و بوون... هەڵبژاردن هەنگاوێکی زۆر بەنرخە بۆ هەموو فەنێك بە تایبەتی بۆ چیرۆك وتویانە فەن هەڵبژاردنە، هونەرمەندی هەڵکەوتوو ئەو کەسەیە کە ئەتوانێت شتی باش هەڵبژێرێ و سەرنجی خەڵك ڕائەکێشێ و هەست و بیریان ئەخەنە جووڵە[1].

ئابەم شێوەیە مارف بەرزنجی وەك شارەزاو لێهاتووی ئەو بوارە یەکە یەکە بنەماکانی هونەری چیرۆکنووسی سەرکەوتووش

[1] هەمان سەرچاوە.... ل ٣٢١- ٣٢٢.

دیاری دەكات، بەوەی چیرۆكنووس (ئەبێ بەشی خوێندەوارانی تیا بهێڵێتەوە تا ئەویش بیری خۆی كەمێ لەگەڵیا خەریك بكاو رەمزەكانی بە مێشكی خۆی هەڵبهێنێ جا ئەوسا هەر خوێندەوارێك بەپێی خۆی و لە چاوی خۆیەوە مانایەكی لێبدۆزێتەوە)[٢].

بە كورتی بەلای مارف بەرزنجییەوە هونەری چیرۆكنووسین لەوەدایە چۆن بابەتەكە هەڵبژێرێ؟و چۆن بیخاتەڕوو؟و چۆن وێنەی دڵگیرو زیندوو بكێشێ؟ چۆن هۆو ئەنجام و راستیەكانی ژیانی مرۆڤ بدۆزێتەوە؟ كە ئەمە بە گرنگترین پێویستی سەرشانی چیرۆكنووسی دائەندرێ؟

بەم جۆرە مارف بەرزنجی توانی لە بواری چیرۆكدا بەسەركەوتوویی بنەمای هونەری چیرۆكەكانی دەربخات.. سەرباری ئەم لایەنە چیرۆكنووس لە بواری شانۆو دراماو رۆمانیشدا دەستێكی بالای بووەو لەم هونەرەشدا ئەسپی خۆی تاقیكردۆتەوەو سەركەوتووانە بەرهەمەكەی پێشكەش كردووە وەك (زەوی زەوی خۆمانە) كە چیرۆكێكی شانۆییە كەلە چوار

[٢] هەمان سەرچاوە.... ل٢٣٢.

*- چیرۆكی (گای پیرۆز لە ژ ١ی پاشكۆی گۆڤاری (الادیب العراقی) مانگی تەمووزی ١٩٦١دا بلاو كراوەتەوە نووسەر لە سەرجەمی بەرهەمەكانیدا رۆژی نووسینی ١٠/٥/١٩٥٩ی داناوە كە لە كەركووك نووسیوویەتی.

پـەردە پێـك هـاتووە... لـە نزیکـەوە ناڵـەی جووتیـاران و زەبـرو زەنگـی دەرەبـەگ و شـادبوونەوەی جووتیـاران بـە زەوی و ئـاوو بەروبەەمی رەنجیان دەدوێ.. ئەم شانۆگەرییە بۆ ئەو سـەردەمەی خۆی شتێکی تازە بوو.

- بەگشتی مارف بـەرزنجی لـە بـواری چیرۆکنووسیدا خـاوەنی گـەلێ چیرۆکە کـە هەریەکـەیان لـە دایـك بـووی سـەردەمی ژیـانی نووسەرەو لە رۆژگارێکی سنووورداری (١٩٥٨- ١٩٦٢)دا لە دایـك بـوون و لـە گۆڤـارە کوردییەکانـدا بڵاوکراونـەتـەوە... بـە تایبـەتی سەرجەم چیرۆکەکان بریتین لە:-

١- ئاوازو کەباب.

٢- گای پیرۆز*.

٣- شەتڵ.

٤- جەژنێکی شادی.

٥- نامەی سەرسنوور.

٦- سەر لە بەیانی نەورۆزێك.

٧- بەسـەرهاتی قوتابییـەکی پـۆلی چـوارەمی حقـوق(تـەواو نەکراوە).

٨- مەمەدەفەندی سەرسام.

٩- پەیکەرەکەی گاورباغی.

**١٠- مەلا برایم. ١١- من و براکەم*.**

* ئەم چیرۆکانە هەندێکیان لە ژیانی نووسەردالە گۆڤارەکاندا بڵاوکراوەتەوە بە تایبەتی (شەش چیرۆکی یەکەم)و پاشان ئەوانی تر لە دوای مردنی نووسەر لە سەرجەمی بەرهەمەکاندا بڵاوکراونەتەوە.

تەوەری دووەم:

## تەکنیکی گێڕانەوەی چیرۆکەکان

پێناسەی گێڕانەوە:

مـــرۆڤ رۆژانـــە رووبـــەرووی چـــەندین رووداوو بەســـەرهات و جارجـــارەش کارەســـات دەبێتـــەوە، جـــا یـــەکێك لـــەو هۆیانـــەی بەهۆیـــەوە ئـــەو رووداوانـــە بـــاس دەکـــات و بەرامبەرەکـــەی رادەگەیەنێت گێڕانەوەیە، کەواتە دەکرێ بگوترێ مرۆڤ لە رێگـای پەنابردنە بەر گێڕانەوەی رووداوەکانی دوێنێـی ژیانی رابردووی توانـای ئـەوەی پەیـداکردووە بـەردەوامی بـە ئامادەبوونەوەیـەکی نوێی دوێنێی خۆی و کەسانی تر بدات.

جـا ئەگـەر تەماشـای رەگـەزی گێڕانـەوە لـە چـیرۆکدا بکـەین دەبینین ئەم رەگەزە وەك خاسیەتێکی بنەڕەتی چیرۆك دیـارکراوە "چیرۆك: بریتیە لـە گێڕانـەوەی کۆمەڵـە رووداوێـك بە شێوەیەکی هونەری کەوا قەومانێك یان چەند قەومانێکی ژیـان یـان سروشـت دەکاتە مایەی سەرنج راکێشان ە بزواندنی هەستی جوانپەروەری و پێگەیاندنی لێکدانەوەی گوێگر یا خوێنەر بەرامبەر بە ژیان"[1]

[1] پەخشانی کوردی، عەبدولرەزاق بیمار، بەغدا ١٩٩٨، ل ٢٦١.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گێڕانەوە دەبێ شێوەیەکی هونەری وەربگرێت و لەلایەن کەسێکەوە ئەنجام بدرێ و ئاراستەی وەرگرێك بکرێت و کەرەستەکەشی گێڕانەوەی رووداوێك یان بەسەرهاتێکەو مەبەستیشی وروژاندنی هەستی وەرگرەکەیە "ئەوەی رووداوەکانیشی لەو شێوەی هونەریدا دەگێڕێتەوە چیرۆکگێڕەوەیەو ئەگەر چیرۆکەکەش نووسرا ئەو چیرۆکگێڕەوەیە دەبێتە نووسەر یا چیرۆکنووس و لە چیرۆکەکەی دەرکێشراوە"(٢).

جا ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە بنەماکانی پێکهاتەی جەستەی هەر چیرۆکێك دەبینین "ئەمڕۆ گێڕانەوە بە یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی بینای هونەری تێکستی هەر چیرۆکێك دادەنرێت.. چیرۆکنووس لە گۆشەنیگایەکی دیاریکراوەوە شتەکان دەبینێت و هەستیان پێ دەکات و وەریان دەگرێت"(١).

گرنگی بنەمای گێڕانەوە لە چیرۆکدا گەیشتۆتە رادەیەك لەلایەن (ئالان رۆب گرێیە) بکرێتە پێوەری سەرکەوتنی بەرهەمەکە بۆیە لەم رووەوە دەڵێت " چیرۆکنووسی راستەقینە ئەو کەسەیە کە

(٢) عالم القصە، برناردی فوتور، ترجمە د. محمد مصطفی هوارە، القاهرە ١٩٦١، ص ١٦٦.

(١) بینای هونەری چیرۆکی کوردی، پەرێز صابر، ل ٢١٥. (نامەی ماجستێر – زانکۆی سەلاحەددین).

دەزانێت چۆن چیرۆکەکە بگێڕێتەوە"[٢] هەروەها "بایەخ و گرنگی ئەم جۆرە تەکنیکە لەوەدایە کە بەیەکەم بنەماو پێوەری سەرەکی دادەنرێت بە تایبەتی بۆ دروست بوون و جیاکردنەوەی ژانرە ئەدەبییەکان و جیاکردنەوەی چیرۆك لە جۆرەکانی دیکەی ئەدەب"[٣].

کەواتە دەتوانین بڵێین کە گێڕانەوە پردێك لە نێوان چیرۆکگێڕەوەو خوێنەر دروست دەکەن و ئامانجی گێڕانەوەش گەیاندنە. یاخود گێڕانەوە دەبێتە ئامرازێك بۆ چنینی پێوەندی نێوان ئەو بنەما هونەرییانەی تێکستی چیرۆکەکەی لەسەر دروست دەبێت.."[٤].

گرنگیدان بەم تەکنیکە وای کردووە نووسەران هەمیشە بایەخی پێ بدەن و گۆڕانکاری بەسەر دابهێنن و شێوەو شێوازی جیاواز وەربگرێت و لە تەکنیکە سادەی گێڕانەوەی مەوزوعی چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان هەنگاو بنێ بەرەو زاتیەتی گێڕانەوەو گۆڕینی راناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) بە راناوی کەسی یەکەمی (من) هەنگاو بنێت و هەستە نادیارو شاراوە

[٢] عالم الروایە، رولان بورنوف وديالى ئوتوليس، ترجمە نهاد التكرلى، بغداد ١٩٩١، ص ٣٧.
[٣] البناو الفنى فى الروايە العربيە فى العراق، شماع مسلم و د. العانى، جامعە بغداد ١٩٨٧، ص ١.
[٤] البناو الفنى لروايە الحرب فى العراق، عبدالله ابراهيم علاوى –بغداد ١٩٨٨، ص ١٦١.

پـــەنگ خواردووكـــانی بـــەبێ پـــەردەو بـــە شـــێوەیەكی ئاشـــكرا دەربخات.

باسی یەکەم:

## جۆرو شێوازەکانی چیرۆکگێڕەوە

خوێندنـــەوەی ســـەرجەم چـــیرۆکەکانی مـــارف بـــەرزنجی، دەمانگەیەنێتە، ئەوەی بڵێین لە نێوان چیرۆکگێڕەوەو شا کەسی چیرۆکەکاندا پەیوەندییـەکی پتـەو هەیـە کـە رووداوەکـانی نـاو چـیرۆکەکان دەردەخـەن و شـێوەو شـوێنی چـیرۆکگێڕەوە لــە دەرەوەو ناوەوەی چیرۆکەکە دیاری دەکات، شێوە جیاوازەکـانی چـیرۆکگێڕەوە لــە نــاو گێڕانــەوەدا دەخاتــەڕوو. کــێ رووداو دەگێڕێتـەوە؟ چیرۆکگێڕەوە چۆن تەماشـای گێڕانەوەکـەی خـۆی دەکا؟ پێوەنـدی چیرۆکگێڕەوە بـەو کەسـایەتیانەی کردارەکانیـان دەگێڕێتەوە چییە؟

چـیرۆکگێڕەوە بـەپێی پـۆلین کردنــی (جـیرار جینێـت) دابـەش دەبێتە سەر دوو جۆر:

یەکەم: چیرۆکگێڕەوەیەك لە ناوەوە رووداوەکان دەگێڕێتەوە.

دووەم: چیرۆکگێڕەوەیەك لە دەرەوە رووداوەکان دەگێڕێتەوە.

(چیرۆکگێڕەوەی جـۆری یەکـەم یـا پاڵەوانێکـە بـە رانـاوی (مـن) چیرۆکـی خـۆی دەگێڕێتـەوە. بـەم مانایـە پاڵـەوان چـیرۆکبێژێکی ئامادەیەو هەموو شتێ دەزانێ ئەگەرچی ئامادە نییە.

بەڵام چیرۆکگێڕەوەی جۆری دووەم کەسێکی شاهیدە بەم مانایە ئامادەیی هەیەو ڕووداو دەگێڕێتەوە[١].

ڕەخنەگری فەرەنسی (جان بویون) جۆری پێوەندی نێوان چیرۆکگێڕەوەو کەسانی ناو چیرۆك بەم شێوانە دابەش دەکات:

چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان (چ. گ. >) واتە چیرۆکگێڕەوە لە شا کەس زیاتر دەزانێت.

چیرۆکگێڕەوەی هەمان شتزان (چ. گ.=)واتە چیرۆکگێڕەوە هەندەی شاکەس دەزانێت.

چیرۆکگێڕەوەی کەم شتزان (چ.گ.<) واتە چیرۆکگێڕەوە لە شا کەس کەمتر دەزانێت[٢].

چیرۆکگێڕەوەی بێ متمانە. واتە زانیاری بە هەڵە بە خوێنەرو گوێگر دەدات؟[٣].

لەتەك ڕاکانی جیرار جینیت و جان بویوندا ڕایەکی تۆدۆرۆۆ هەیە کە ئەویش (بینین) دەکا بە پێوەر بۆ جۆرەکانی چیرۆکگێڕەوە کە بەم جۆرە دابەشیان دەکا:

[١] تقنيات السرد الروائي في چوو المنهج البنيوي – يمنى العيد، لبنان ١٩٩٠. ص ٩٠– ٩١. بناو الروايە. د. سيزار قاسم، بيروت ١٩٨٥ ص ١٨١.

[٢] بڕوانە بینای هونەری چیرۆکی کوردی .... پەرێز سابیر.. ل ٢١٧.

[٣] النقد التكبيقي التحليلي. د. عدنان خالد عبدالله. گ١. بغداد ١٩٨٦. ص ٨٥.

یەکەم: چیرۆکگێڕەوە لە پاڵەوان پتر دەزانێ (بینین لە پشتەوە یان لە دواوە).
دووەم: چیرۆکگێڕەوە بە قەدەر پاڵەوان دەزانێ (بینین لەگەڵ...)
سێیەم: چیرۆکگێڕەوە لە پاڵەوان کەمتر دەزانێ (بینین لە دەرەوە)[٤].

لە جۆری یەکەمدا کە چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزانە لە دواوە یا لە پشتەوە ئاگاداری هەموو رووداوەکانی ناو چیرۆکەکەیە (دەزانێ چی روودەدات و دەورەکان بەر کێ دەکەوێ؟ و کارەکان چۆن دابەش دەکاتە سەر شاکەس و رووداوەکان چۆن دروست دەبێ و چۆن پەرەدەسەنێت.

هەرچی پەیوەندی بە شێوازی گێڕانەوەی ئەم جۆرە بێت ئەوەیە راناوی کەسی سێیەمی نادیار بەکار دێنێ[٥]. لەم جۆرە گێڕانەوەیەدا هەمیشە وەرگر شوێنکەوتووی چیرۆکگێڕەوەیەکە[٦] لەمەش گرنگتر چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان دەبێ رادەی زانیارییەکانی کە بە خوێنەری دەگەیەنێت

[٤] تقنيات السرد الروائى فى چوو المنهج البنيوى- يمنى العيد بيروت ١٩٩٠. ص ٩١.
[٥] القصه القصيره نقريا وتگبيقا. يوسف الشاردنى -سلسله كتاب الهلال -العدد ٢١٦. مصر ١٩٧٧. ص ٧٠.
[٦] بینای هونەری چیرۆکی کوردی... پەرێز سابیر ل ٢١٨.

دەبێ دیاری بکات و سەرنجی خوێنەریش بۆ چەند زانیارییەکی دیاریکراو رابکێشی"[1].

جۆری دووەم: لە جۆرەکانی گێڕانەوە پێی دەوترێت (بینین لەگەڵ) ئەمەش و چیرۆکگێڕەوەی هەمان شتزانە کە ئەو شتانەی دەزانێ کە کەسانی ناو چیرۆکەکە دەیزانێت و شوێنی چیرۆکگێڕەوەکەش لە پاڵ کەس و رووداوەکانەوە بەستراوە بە شوێنێکی دیاریکراوەوە. چونکە توانای ئەوەی نییە، بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت، لە ئاست شوێن و کات بکات. لەم جۆرە گێڕانەوەیەدا چیرۆکگێڕەوە لەگەڵ رووداوەکان دەوەستێ نەك لە پشتیانەوە[2].

ئەو راناوەی بەم جۆرە گێڕانەوە بەکار دێت، راناوی کەسی یەکەمی بگۆی (من) بە چیرۆکنووس راناوی کەسی یەکەمی بگۆ لە چیرۆکەکەیدا بەکار دەهێنێت و خۆی دەخاتە شوێنی شاکەسی چیرۆکەکە یا شوێنی یەکێك لە کەسە لاوەکیەکان و بە زمانی ئەوان دەدوی"[3]* چیرۆکگێڕەوەی هەمان شتزان هەر لە

[1] النقد التكبيقى التحليلى. د. عدنان خالد عبدالله. ص ٨٦.

[2] الالسنه والنقد الآدبى ف النقريه والممارسه. د. موريس ابو نافل. بيروت. ١٩٧٩. ص ١١٨.

[3] فن القيصه. دكتور محمد يوسف نجم... ص٧.

ناوەوەی چیرۆکەکەدا دەمێنێتەوەو کەسەکانیش لە گۆشەنیگای دیاریکراوەوە دەبینێت.

جۆری سێیەم: لە جۆرەکانی گێڕانەوە ئەوەیە کە پێی دەوترێ (بینین لە دەرەوە) چیرۆکگێڕەوەی ئەم بوارە دەڵێن (چیرۆکگێڕەوەی کەم شتزان) چونکە زانیارییەکانی چیرۆکگێڕەوە بە هۆی بینین و بیستن زانیاری دەست دەکەوێت واتە سەرچاوەی پەیداکردنی ئەو زانیارییانە تەنها ئەم دوو هەستەیە[٤].

جۆری چوارەم: چیرۆکگێڕەوەی بێ متمانە کە زانیاری بە هەڵە پێشکەش بە خوێنەر دەکات (لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجی بەدی ناکرێت).

بەگشتی ئەم جۆرە گێڕانەوانەی سەرەوە دەتوانین بەسەر چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا پراکتیزە بکەین بە تایبەتی ئەو چیرۆکگێڕەوانەی لە دەرەوەی رووداوی چیرۆکەکە دەزانێت یاخود ئەو چیرۆکگێڕەوەی لە ناوەوە رووداوەکان دەگێڕێتەوە بەپێی بنەمای بینینەکانی.

---

* زۆر لە رەخنەگرەکانی ئەورووپی بە تایبەتی یەکێکی وەك تۆدۆرۆف لەم جۆرە گێڕانەوەیە هەر راناوی کەسی یەکەمی بگۆ (من) بەکار ناهێنێ بەڵکو ئاماژە بە راناوی کەسی سێیەمی نادیار (ئەو) پشت دەبەستێ کە لەوانەیە لەیەك چیرۆکدا بەکار بهێنرێت.

[٤] بینای هونەری چیرۆکی کوردی... ل ٢٢٣.

لــه چــیرۆکەکانی مــارف بەرزنجیــدا شــوێنی چــیرۆکگێڕەوەی (هەموو شتزان) لە چیرۆکەکانی دیارە وەك چیرۆکی:

١- ئاوازو کەباب.
٢- گای پیرۆز.
٣- پەیکەرەکەی گاورباغی.
٤- بەسەرهاتی قوتابییەکەی پۆلی چوارەمی حقوق (تەواو نەکراوە).
٥- مەلا برایم.
٦- مەمەدە فەندی سەرسام.

- تەکنیکی گێڕانەوە لە چیرۆکی (ئاوازو کەباب)دا هەر چەندە گێڕانــەوە لەلایــەن یــەکێك لــە کەســەکانی نــاو چــیرۆکەکەیە بــەڵام ئاگاداری هــەموو رەهەنــدو لایەنــە نادیــارو شــاراوەی کەســەکان و ژیــانی رابوردویانــە ئــەوەش وای کــردووە کــە چــیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان دەربکەوێ. شاکەسەکان (فلامورز و میرزا)ن لە ژێـر دەسەڵاتی چیرۆکگێڕەوەدان و بە دەستیەوە وەك بووکە شووشـە وان چـۆنی بوێـت وا دەیـان جوڵێنێـت و بـەرەو ئـەو مەبەسـتەیان دەبات کـە خـۆی دەیـەوێت... هـەروەها بە جـۆری راناوی کەسـی سێیەمی نادیار (ئەو) رووداو و کەسەکانمان پێ دەناسێنێت کە کەســە ســەرەکیەکان (فلامــورز و مــیرزا)یــەو کەســە لاوەکیەکــە

(جەمولـــە)یـــە، چـــیرۆكگێڕەوە لـــە دەرەوە بـــەهۆی شاكەســـەوە كەسەكانی پێدەناسێنێت و هەموو شتێك دەربارەی كەسەكان بە ئێمـــە رادەگەیـــەنیٚ (ئـــەم جووتـــە كـــوڕە، فلامـــورزو مـــیرزا وەك كەڵەشێری جەنگی گەڕەكەكەمان بوون بە گیانی یەكتر سوور، گـەلیٚ كـەس وایـان تـیٚ ئەگەیـشت كـە زۆر لـە پـارێزی یـەكتر دەگەڕێن، ئەگەر هەر كامێكیان بە تەواوی بە خۆیا بدیا بەبیٚ سیٚ و دوو لـەوەی كـەیان ناكـا، بـەڵام وایـان دانـابوو لـە وریـایی هـــەردووكیان بـــوو كـــە خۆیـــان بـــە دەســـتەوە نـــەداوە)[1] چیرۆكگێڕەوەی هەموو شتزان یەكە یەكە كەسەكان لە دەرەوە بۆ نـاوەوەی چیرۆكەكە پێشكەشمان دەكات ئەوەتە بە شێوەیەكی راپـــۆرت ئاســـا لـــە هـــەموو شـــوێنێكی چـــیرۆكەكە ئامادەیـــەو زانیاریمـان لـە رووداوو وەسـفی كەسـەكانی نـاو رووداوەكـان و ئـازایی و جـوامێری و ترسـنۆكی و رق ئەسـتووری كەسـەكان دەردەخـات و لەلایـەكی تریـشەوە دانیـشتوانی گـەڕەك بە هـەموو توێـــژەكان دەردەخـــات. پاشـــان چـــیرۆكگێڕەوە دەچـــێتە نـــاو چـایخانەی گـەڕەك، گـەلیٚ زانیاریمـان سـەبارەت بـە شـوێن و دارەشۆربییەكان و جۆگەلەو جۆری یاری كردنـی تاوڵەو دۆمینەو پێكدادانی فلامورز و میرزاو جەمول و دادگایی كردنی میرزاو دڵ

[1] چیرۆكی (ناوازو كەباب)... ل ١٤٦. (سەرجەم بەرهەمەكانی مارف بەرزنجی).

نەرمی میرزاو ڕێگەگرتنی میرزا لە خراپەکاری بۆ چاکی ئەمانە لای چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان پێشکەش بە خوێنەر دەکات و بە شێوەیەکی چڕو پڕ وەسفی کەس و شوێنەکان و دیمەنەکان بەرجەستە دەکات.

سەرباری ئەمانە چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان دەچێتە ناوەوەی کەسەکان بە تایبەتی وێنەی میرزا کە لەلایەن فلامورزەوە سەرزەنشت دەکرێ و ئامۆژگارییەکانی وەردەگرێ، (میرزا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، خوێنێکی کەم هاتە ڕوومەتە زەرد هەڵگەڕاوەکەی، تەڕی کەوتە لێوی بەباری).

سەرباری ئەم لایەنە چیرۆکگێڕەوە دەچێتە ناو گیروگرفتەکان و بەدوای چارەیەکدا دەگەڕێ و دەیەوێ بەزاری شاکەسەوە بڵێ:

(با واز لە شەڕو ئاژاوە بێنین و هۆکارەکانی شەڕکردن) واتە باواز لە خەنجەر بێنین و بیانخەینە مۆزەخانەوە لەسەر بنەمای خوێندنەوەو ڕێزگرتن لەگەڵ یەك مامەڵە بکەین.. لێرەدا چیرۆکگێڕەوە خودی نووسەرە دەیەوێت ئەو مەبەستەی خۆی دەربڕێت، کە کەسی خراپەکارو شەڕانگیز هیچی بەهیچ نابێ و دەبێ واز لە خراپە و شەڕانگیزی بهێنێت تا بتوانێت بە ئاسوودەیی بژی (خەنجەر بۆ کەباب وتفەنگ بۆ ئاوان).

– ئەگەر بەووردی سەیری کەسیەتی میرزای شاکەس و ئەو گۆڕانانەی تیا ڕوویدا بکەین، ئەوا بەئاشکرا مەبەستی

چیرۆکگێڕەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت... ئەوەتا میرزا سەرەتا کەسێکی شەڕانی و ئاژاوەچی بوو بەهێز و تواناو ئازایەتی خۆی دەنازێت، بەڵام چیرۆکگێڕەوە کەسێکی وەك فلامورزی لێ ڕاست دەکاتەوە تا تەمێ بکات و ناچاری بکات واز لە شەڕکردن بهێنێت و چیتر ئازاری کەسانی دیکە نەدات

ئەم هەڵگەڕانەوەیەش دەبێتە هۆی ئەوەی لای خەڵك خۆشەویست بێت و ڕێزی بگیرێت. نووسەر لەم چیرۆکەدا ڕەمزی بەکارهێناوە —خەنجەر بۆ کەباب و تفەنگ بۆ ئاوان).

– لە چیرۆکی گای پیرۆزدا گێڕانەوەکە لەلایەن چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزانە کە ئاگاداری هەڵسوکەوتی کەسەکانەو بواریان پێ دەدات گفتوگۆ بکەن. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی لەگێڕانەوەی ڕاستەوخۆ خۆی بە دوور بگرێ.

– شێخ و مامۆستا، شاکەسی چیرۆکەکەن و چیرۆکگێڕەوە دوو مەودای کۆمەڵایەتی دەخاتە روو ئەویش پلەی چینایەتی شێخ و مامۆستا دەردەخات. شێخ و پلەی چینایەتی دەسەڵاتدارە خاوەن زەوی و زارو مسکێنێکی زۆرە.. هەموو شت بە دەست ئەوەو دیوەخانی هەمیشە قەرەباڵغ و هەریەکە لە ئاشێك لێ دەکەن.. بە دڵی دەجوڵێنەوەو بە تایبەتی کاتێ شێخ بینی فەلاح و ڕەنجبەری روو لە مامۆستای دێیەکەی کرد گومانی پەیدا کردو دڵی لە مامۆستا ڕەش کردو مامۆستاش نوێنەری

بەرەی نوێ و چینی چەوساوەو ڕێگە ڕۆشنکەرەوەو خەمخۆری بێدەستەڵاتان دادەنا تەنانەت دەستی لە تیمار کردنی نەخۆشدا هەبوو... ئەمانە چیرۆکگێڕەوە وەك شریتی سینەما هەموو دەورەکان و هەموو کەسە لاوەکیەکانمان وەك (خەلیفەو مەلاو کوێخای دێ) یەکە یەکە نیشان دەدا، چیرۆکگێڕەوە کە خودی (نووسەرە) ئاوا باسی دەسەڵاتی شێخ دەکات.

((شێخ لە ناو کۆ دڵی سادەو ساویلکەی ئەو هەرێمەدا پایەیەکی بە رواڵەت بەرزو بڵندی بۆ خۆی گرتبوو. دەست ماچ کردن و لێشاو شەکرو چاپەزو ئاژەڵ و پوول و پارەی خۆڕایی بە کارەکەرو نۆکەری بە نانەزگ بێ تۆز لێنیشتن و ئارەق رشتن خۆش خۆری و تەرپۆشی)).

چیرۆکگێڕەوەی هەموو شت زان زۆر بە وردی وێنەو وەسفی یەکەیەکەی کەسەکان دەکات سەرباری ئەمەش نەك هەر لایەنی فیزیکی کەسەکانمان پێ دەناسێنێ بەڵکو چیرۆکگێڕەوە ناوەوەی کەسەکانیش شارەزایەو زانیاریەکانی بە خوێنەر دەگەیەنێ کە دەچێتە ناخی شێخەوەو دەڵێ:

"شێخ لەمەراقا هەرتووکی سمێڵی خۆی ئەبرد بەدەماو پیشی ئەخواردەوە.. بەڵام دەردی دڵی خۆی بۆ خەڵکەکەی دەوروبەری خۆی دەرنەئەبڕی هەر بە ئاخ و ئۆف و های و هۆو بەبا ئەدا".

تەنانەت چیرۆکگێڕەوەی هەمووشت زان ڕێگەی گفتوگۆ بە شێخ

و مامۆستا دەسپێرێ و رووبەڕووی یەکیان دەکاتەوەو ئەنجام مامۆستا بەخۆڕاگری و (لەسەرخۆو بێدەنگی لەناو کۆڕەش و شێفەخۆی رزگار کرد بەدەم رێوە لەبەر خۆیەوە هەر ئەیوت گای پیرۆز.. گای پیرۆز لە هیندستانیش گا دەپەرستن)[1].

هەروەها دەوری مامۆستا وەك روناکبیرێك و خاوەن ئەزموون دەردەخات کە دڵخۆشی خاڵۆ حەمە رەشید دەداتەوەو داوای خۆڕاگری لێ دەکات و ئەوەی تێدەگەیەنێ کە (ئەم دەسگای فرۆفێڵانەش زۆری نەماوە، دادەتەپن و دڕکی ئازار لە گیانی هەژاران دەرهێنرێ و دنیا یەکسان دەبێ و پۆلیسشمان ناوێ و خۆمان پۆلیسی خۆمان دەبین...[2] ئاوا چیرۆکگێڕەوە شێخ بەگای پیرۆزی نەخوێندەوارەکان دادەنێ و بە رووخانی دەزگای دەرەبەگی و دەوری گەل و ژیانێکی نوێ دەخاتە پێش چاوی خەڵکە تێگەیشتووەکە

- لە چیرۆکی (پەیکەرەکەی گاورباغی)دا چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان کە لە دەرەوەی چیرۆکەکەیە دەسەڵاتی بەسەر هەموو لایەنێکدا هەیە بە ئارەزووی خۆی لە دەرەوە بۆ ناوەو لە رێگەی شاکەسی چیرۆکەکە (مولَّلا) رووداوەکان دەگێڕێتەوە،

(1) چیرۆکی گای پیرۆز...(سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی) ل ١٥٣.

(2) چیرۆکی گای پیرۆز..... ل ١٥٩.

چیرۆکگێڕەوە هەوڵی دەستنیشان کردنی شوێنەکانی ناو شاری کەرکووك دەکات و وەسفێکی وردی گەڕەکەکانی (قۆریەو تسعین و تەکیەکان) دەکات... نووسەر چاك شارەزای (موڵڵا)یەو لە مێژەوە ئاشنای یەکتربوون... چیرۆکگێڕەوە بەزاری (وسوو) باسی شتی تازەی بۆ موڵڵا دەکرد مەلاش بە پێچەوانەوە شتی رابووردووی دەگێڕایەوەو زۆر دونیای دیبوو... تەنانەت (ساڵەها دەف زەن و دێوانەو کەللەو شێتی تەکیە بووە... پرچێکی لوول و خاوو چڕو پڕو تاسەر سێ بەنەی لەسەر یەك پێ خۆبادان و خولانەوە لە شەوی هەینیداو بانگی دەرکردبوو)[٣]... بەم جۆرە چیرۆکگێڕەوە هەموو لایەنەکانی (موڵڵا) ئاشکرا دەکات کە چۆن موڵڵا سەوزەفرۆش بووەو لە رۆش بووەو لە بازاڕی قۆریە دوکانێکی بچووکی سەوزەفرۆشی هەبوو

کاسبیەکەی بەشی ئەوەی نەکردووە منداڵەکانی تێرو پۆشتەو پەرداخ بکات و هەر هەوەس و خەیاڵی لای زیارەتی کەربەلاو موریدی شێخ بوو... چیرۆکگێڕەوە خۆی دەخاتە شوێنەکان و هەڵوێستی موڵڵا ئاشکرا دەکات بەوە بەرەکەتیان دەخاتە روو کە نەهوو هۆی شێخ خەلیفە هەواس و نە زیارەتی کەربەلاو نەجەف بەرەکەتیان نەخستە دوکانەکەی و باریان سووك نەکرد.. ئا ئاوا

(٣) چیرۆکی پەیکەرەکەی گاورباغی (سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی)... ل ١٨٠

چیرۆکگێڕەوە شارەزای هەموو لایەنێکی ناو چیرۆکەکەیەو لە دەرەوە بۆ ناوەوەو بە پێچەوانەوە لە ناوەوە بۆ دەرەوە ئەوەتا ئەو هەموو ماندوو بوونەی مولّلا ئاخری خۆی لە تەکیەو حوسێنییە دزییەوە... پاشان چیرۆکگێڕەوە یەکە یەکەی کەسەکان پێ دەناسێنێ لەگەڵ وەسفی وردی کەسەکان هەر بۆ نموونە (کیمیاگەرێك) کە خەڵکی بەناوی (سەیدە ئەفغانییەکە) ناویان دەبرد پێمان دەناسێنێ، کە چۆن خەریکی جادووگەرییەو (جادووی وا دەزانێ کە جۆ بە دیوارا سەر ئەخاو ژن و مێرد لێك جودا ئەکاتەوە) چیرۆکگێڕەوە هەوڵ دەدات ناوەوەی کەسەکان بناسێنێ و لە رێگەی زانینی کەسیەتی مولّلا کیمیاگەرەکەی بۆ دەرکەوت کە جاسوسە...

چیرۆکگێڕەوە لە کارەساتی (گاورباغی) دەدوێ و دەردەکەوێ کە خودی نووسەرە دەوری لەو کارەساتەدا بووە. دەوری کرێکارێکی وشیاری لە ناو کرێکارەکانی نەوتی کەرکووك هەبوو... کە چۆن خەریکی دامەزراندنی نەقابەن وداخوازی و خواست و ئاواتەکانیان بوون.. کرێکارەکان بە چەند زمانێك و چەند نەتەوەیەك یەکی گرتبوو... کار گەیشتنە مانگرتن و خۆپیشاندان و کۆبوونەوەیان لەگاورباغی... چیرۆکگێڕەوە وەك سیاسی و رۆشنبیرێك هەوڵ دەدات باری ئایدیۆلۆژیەتی چینی کرێکاران ودروشمەکانیان کە بەرزیان کردبوو دەربخات،

کارەساتی (گاورباغی) مولّلای گۆڕی (و پرچە نازدارەکەی بە یەکجاری بە مەکینەی سێ نەمرەی تێ نا)و لە داخی ئەم کارەساتە کە هەردەم بۆ (وسوو)ی دەگێڕایەوە لەو خۆپیشادانانە کرێکاران بە شالاوی پۆلیس کەوتوون، ئەمانە کاریان لە مولّلا کردو چیرۆکگێڕەوە گەلێ زانیاری پێشکەش خوێنەر دەکات کە لە زاری مولّلا دەیگێڕێتەوەو مولّلا هەرگیز کارەساتی (گاورباغی) لە یاد نەچووەو ناوەوەی هەژاندوەو هەمیشە داخ لە دڵ بووە... چیرۆکگێڕەوە لە گۆشەنیگای کەسەکانەوە دەخاتە روو و قسەکانی (وسوو) بۆ مولّلا ئاسۆیەکی رووناك بووە لە جەرگەی خەمەکانیدا، یەکگرتنی کرێکاران و جەماوەر بوو بەرامبەر ئیمپریالیزم و کۆمپانیەکانی و نوکەرەکانی...

(وسوو) خودی چیرۆکگێڕەوەیە پلان بۆ پاشەرۆژی نیشتمانپەروەران دادەنێ و ژیانێکی بەختەوەری بۆ کرێکاران و هەژاران دەخولقێنێ و سەربەستی و ئازادی نیشتمان لە ئاسوودەیی کامەرانی گەلدایە.. چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان هەموو لایەنەکانی کرێکارانی نەوت و چاونەترسی سەرکردەکانیانمان پێ دەناسێنێ کە ئەوانە (نە پارەو بەرتیلی

کۆمپانیاو نه به هەڕەشەی پۆلیسی میری سەریان شۆڕ نەکرد لەداخوازییە رەواکانیان نەهاتنە خوارەوە)[1].

لەلایەکی ترەوە باسی یەکگرتنی بازرگان و دوکانداره‌کان و کرێکاران دەکات کە یەکگرتنیاندەبێتە هۆی جێبەجێ کردنی مافەکانیان وەك (زەوی بۆ جووتیار و بازاڕ بۆ بەرهەمی بازرگانی نیشتمانی) چیرۆککگێڕەوە بە زاری (وسوو)و لەگەڵ (موڵلا) ژیانی تایبەتی خۆیان لە سایەی ئەو یەکگرتنە دەردەخەن کە خانوەکانیان تازە دەکرێنەوەو منالەکانمیشیان پۆشتە دەبێ... پاشان کەسەکان دێنە گفتوگۆ وەك تەکنیکێکی تری گێڕانەوە کۆمەڵێ پرسیار دەوروژێنێ دەربارەی پاشەرۆژی میللەت و دەرکردنی بێگانەو تۆڵەی شەهیدان و پەیکەر دروست کردنیان لە ناو باغەکەی (گاورباغی).

لە دەرەوە چیرۆککگێڕەوە رووداوەکانی رابووردوو کورت دەکاتەوەو دەوری (وسوو) لە جوولانەوەو رێبازو باوەڕی پتەو، لە رێگای دوورو سەختی ژیان دەردەخات. هەر لە گۆشەنیگای چیرۆککگێڕەوە (وسوو)و مولڵا دەکەونە ژیانی خۆشی و ئاسوودەیی و پەیکەری شەهیدەکانی گاورباغی بە بڕیاری

[1] هەمان سەرچاوە...... ل ١٨٤– ١٨٥.

نەقابەش دروس دەکریٚ و جیٚگەی کریٚکار لە ناو جەرگەی دڵی میللەت دادەنیٚ.

لەناو چیرۆکەکاندا جۆری چیرۆکگیٚڕەوەی هەموو شتزان کە لەدواوە رووداوەکان دەبینی و دەیگیٚڕیٚتەوە پترن لە چیرۆکەکانی ترو زیاتریش شیٚوازەکانی بابەتین.

جۆری دووەم:

## چیرۆکگێڕەوەی هەمووشتزانە (بینین لەگەڵ...).

ئەم جۆرە گێڕانەوەیە لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجی دەبینرێ بە تایبەتی لە چیرۆکی:

١- جەژنێکی شادی.

٢- سەر لە بەیانی نەورۆزێك.

٣- من و براکەم.

لە چیرۆکەکاندا جۆری گێڕانەوە لەوەدایە کە شوێنی چیرۆکگێڕەوە لە دەرەوە چیرۆکەکە بۆ ناوەوەی چیرۆکەکەیە لەگەڵ کەس و رووداوەکان دەگوێزرێتەوە.. واتە چیرۆکگێڕەوە هێندەی کەسەکان رووداو یاخود شتەکان دەزانێت و بە هۆی راناوی کەسی یەکەمی بگۆی تاك یاخود کۆ (من)، (ئێمە) چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە.

- لە چیرۆکی (جەژنێکی شادی)دا چیرۆکگێڕەوە شوێنی ناوەوەی چیرۆکەکەیەو یەکێکە لە کەسانی ناو چیرۆکەکە واتە بەسەرهاتی خۆی و هاورێکانی دەگێڕێتەوە.

(ئەمڕۆ شانزە مانگ و سێ رۆژ بەسەر گرتنمانda تێپەڕی، ئەم ماوەیە چەند رۆژێکی نەبێ هەمووی لە ژوورێکا بردوومانەتە

سەر کەسێك نەماوە کە پێش ئێمە هاتبێتە ئەم زیندانەو ئێستە مابێتەوە چونکە هەر یەکە لەوانەو گەلێك لەوانەش کە دوای ئێمە هاوردوونیان، هەر کەس بەپێی خۆی سزایەکی بۆ دروست کراوەو بەرەو زیندانێکی کە کراوەتەوە.. کاتێك ئێمەیان هێنایە ئێرە بەگران جێگامان بۆوە رەنگە ئەگەر ئێمەمانان نەبووینایە هەر بەپێوە لە ناوەڕاستی حەوشەکە رابوەستینایە. لە ژوورەکاندا لەش بەسەر لەش کەوتبوون لە نیشتمانپەروەران و دیموکراتخوازان و کرێکاران و جووتیارانی خواروو ژوور. هەمە رەنگ دەبینی لەپارێزەرەو، پزیشك، ئەندازیار، مامۆستا، کرێکار، جووتیار، قوتابی، کاسبکار تەنانەت دەروێش و حاجیش تەمەن لە ژوور حەفتا ساڵانەوە تا خوار)[1].

بەم جۆرە چیرۆکگێڕەوە خۆی خستۆتە بەرگی شاکەسی چیرۆکەکەو هەندەی ئەو کەسە دەزانێت و رووداوەکە دەگێڕێتەوە چونکە وەك هەموو چیرۆکگێڕەوەیەکی هەمان شتزان شوێنی لەناو چیرۆکەکەداو ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی هەنگاو هەڵێنێ وهەموو شتەکانی کەسەکانی بزانێت چونکە ئەو سەربەستیەی بە کات و شوێنی دیاری کراو پەیوەستە یا خۆی دەچێتە لای کەسەکان یان کەسەکان دێنە شوێنی ئەو.

[1] جەژنێکی شادی (سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی)... ل ١٦٨.

چـيرۆكگێڕەوە شـوێنی شاكەسـەو رووداو دەگێڕێتـەوەو لـە زينداندايـە باسـی ژووری زينـدانمان بـۆ دەكـات... (لـە ژوورێكـی چوار پێنج مەتريدا بيست و دوو كەس تێك ترانجاين بیٚ شوێن دياريكردن... كەسيش ئاگای لە پێلاوو سۆڵی خۆی نەمابوو... لەگەڵ ئەو تيكترانجانەيشدا هەموو ئەيانگوت! لە عێراق زينـدان لـەم زيندانـە چاكتر دەسـت ناكـەوێت لەسـەر ئەمـەوە هـەر لايـەك سەرگوزەشتەی خۆيـان ئەگێڕايـەوە، هەنـدێكيان ئـەيان وت ئێمـە (٣٨) شـەو لـە ژوورێكـدا بـووين هـەر جێگـای هەشـت كەسـی ئاسايی تێدا ئەبووەوە بەڵام ئێمە سيو پێنج كەس بووينەو ناچار بـەم چەشـنـە دەخـەوتين...) چـيرۆكگێڕەوە يادگـارو جـۆری گرتنەكەو باری ناو زيندان بە زاری شاكەس دەگێڕێتەوە.. پاشان دێتە سەر سەرگوزەشتەی كەسەكانی ناو زينـدان و ژيانيـان چۆن بەسەر بردووەو سزايان چی بووە، چيرۆكگێڕەوەی هەمان شتزان هەر هێندە دەزانیٚ كە خۆی خستۆتە خستۆتە جێگەی شـاكەس و رووداوەكـان دەگێڕێتـەوە، هـەموو شـێوەی تـەعزيب و لێـدان و خەوتن تا جياكردنەنەی زيندانيەكان باشی گوزەرانيـان وەك يـەك پـەرەی هـاوبيرو بـاوەڕ زيندانيـەكان پێكـەوە چايان لێـدەنا (يـەك عەمار، يەك مەنجەڵ و چۆن يەك لە بەشدا يەكيـەتی و هاوكاری و هاوبەشـی هـەموو كـەمتر ئـەرك و زۆرتـر خـۆراكی پـیٚ دەبـرا) شاكەس شوێن و ساڵی زيندانی(١٩٦٠)مان بۆ دەگێڕێتەوە كە لە

راستیدا بەسەر هاتی خۆی دەگێڕێتەوە کە جەژنە، جەژنی خۆشی وسەلامەتی بەلاّم خۆی زیندانیەو لە ناو زینداندا لە کرێکارەکان ورد دەبێتەوە کە ژووریان بۆ دروست دەکەن چەند کرێکارێك سەرنجی راکێشاو وەسفی هێزێکی دیویی دەرەوەو لاوازی کرێکارەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە.... جەژنێکی شادی جەماوەر بە سۆزو تینەوە هاواریان دەکرد (دیموکراتیەو سەلام) (سەبعین بیل میە حوریە، سەحافە وەتەنیە) ئەم لەم چاوەڕوانیەو کرێکارە بە تەمەنەکەش بە ئحم ئحم گاڵتەی بە جەژنەکە کرد چونکە خۆی حەوت چەرخ و دەوری بینی بوو داخوا هەزاران چەند دەوری تر دەبینن... هەزاران زوو نامرن... نامرن) بەمە چیرۆکگێڕەوە دڵخۆشی خۆی دایەوەو چیرۆکەکەش تەواو بوو.

— لە چیرۆکی (سەر لە بەیانی نەورۆزێك)دا[1] چیرۆکگێڕەوە چاوی کامێرا لە دەمی خۆرکەوتنی جەژنی نەورۆز دەدوێ.. لە دەرەوەی چیرۆکەکەوە بۆ ناوەوەی چیرۆکەکە هەنگاو دەنێ و خۆی لە ژوورێکی باڵەخانەکەی ماڵەکەیانەوە بەپێی شوێن و کات چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە... گەڕانەوە بۆ دواوە بۆ یادگارییەکان بۆ لوتکەی گڵەزەردەو ناوچەی تەکیەو جافەران،

[1] سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی... ل ١٨٨... پێشتر ئەم چیرۆکە لەلایەن جەمال خەزنەدارەوە لەگۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٧٢ بڵاوکراوەتەوە.

راوی (قـۆپی) ژیـانی خۆشـی و سـادەی جـاران دەگێڕێتـەوە.. زانیارییـەکانی ئـەو سـەردەمەو ئێـستاو غـەم و پـەژارەو ژێردەستەیی بێگانەمان بۆ دەگێڕێتەوە.. زۆرجار بیرەوەرییەکانی چرووپڕ شەپۆلی هۆش دەوری خۆی دەبینێ کە لە بابەتێکەوە بۆ بابـەتێکی دوورتـر هـەنگاو دێـنێ و هـەموو بیرەوەرییـەکانی سـەردەمی رابـووردوو گـۆرانی و شەوچـەرە خـواردن لەگـەڵ هاوڕێیاندا.. لەگەڵ خزمان و یاری جاران و ئێستاو.. ئەمانە لە گۆشەنیگای چیرۆکگێڕەوە رووداوەکان دەگێڕێتـەوەو کەسـی دی بەشـداری ناکـات لـە ژوورەکـەی خۆیـدا ئـەم بەراوردە سادەیەی دوێـنێ بـە دونیـای پـڕ جـەجاڵی ئـەمڕۆ بـەراورد دەکـات... هاوڕێکانیش هەریەکە بە کارێکەوە خەریك و چیرۆکگێڕەوە بە مردنی باوکی و قـەرزێکی زۆرەوە بە ناچاری بوو بە نووسەری (دادگا) لێرەدا چیرۆکگێڕەوە خۆی نووسەرە ژیانیخۆی فلیم ئاسا دەگێڕێتـەوە... چـی لـە هەگبەکەیدایـە لـە رابـووردو ژیـانی رابووردوو تا ئێستا لە شوێن و کـاتی خۆیـدا دەگێڕێتەوە ئەگەر شاکەس خۆی بێت زانیارییـەکانی هەر هێندەیە بەقەد شاکەسە کـە خـودی چـیرۆکگێڕەوەیە... زانیارییـەکانی رووداوی رۆژی نەورۆزو قەدەغەکردنی نەورۆز، گۆڕانی نـەورۆزو شـار بە دەسـتی یاسـاوڵ و پـۆلیس و رژێمـی زۆردار بـوو بـە شـین و نـەورۆزیش بەژان.. فلیمـی تـرس و تۆقانـدن.. کۆمەڵە شـەپۆلی یادەکانن کە

کوڕی نووسەر (پۆلا) لێ دەداو (کۆمەڵێ دەنگی) کوڕو باوک تێکەڵ بەیەك دەبن و شەپۆلی هۆش* دەور دەبینێ و کوڕە دڵخۆشی باوکی دەداتەوەو چیرۆکەکە کۆتایی دێت). بەڕاستی جۆرە گێڕانەوەیە وەك یادنامە وایە کە چیرۆکگێڕەوە بە شێوەیەکی هونەری و لە بێزاریدا یاداشتی دوێنێ خۆشی و سادە، ئەمڕۆی پڕ کێشە دەگێڕێتەوە.

* ئەم تەکنیکی گێڕانەوەیە لە تەوەرەیەکی سەربەخۆدا باس دەکرێ.

جۆری سێیەم:

چیرۆکگێڕەوەی کەم شت زانەکە لە دەرەوە شتەکان دەبینێ و دەبینێت و لە شاکەسی چیرۆکەکە کەمتر شت دەزانێت و بۆ پەیدا کردنی زانیاریەکانیشی هەر لە ڕێگەی بینین و دیتنەوە پەیدا دەکات هەر کاتێك لەو شوێنە دوورکەوێتەوەو توانای بینین بیستنی کەسەکانی نامێنێت هەر بۆیە لە شوێنی خۆیەوە گوێ لە قسەکانی (مامۆستاو ئەفەندی) دەگرێ. پەنا دەباتە بەر وەرگرتنیزانیاری لەم کەسانەوەو زۆر جاریش خۆی بە ناسینی ئەم کەسانە ئاشکرا دەکات وەك لە چیرۆکی (شەتل) (نامەی سەرنووسەر) دیارە.

لە چیرۆکی (شەتل)[1]دا چیرۆکگێڕەوەی کەم شتزان لە کەسانی ناو چیرۆکەکە کەمتر شت دەزانێت و سەرچاوەی زانیارییەکانی لە ڕێگەی بینین و دیتنەوە بەردەست دەکەوێ لە ڕێگەی (نامەوە) کاتێ چیرۆکگێڕەوە گەیشتنە شاری (ت) دەبوو سواری ئۆتۆمبیلێك بێ کاتێ ئۆتۆمبیلەکە پڕ بوو دوو ئەفەندی یەکێکیان لای چیرۆکگێڕەوە ئەوەی تریش لە پشتەوە دانیشتبوو گفتوگۆیان دەکرد ماموستان... شاکەسی چیرۆکەکە مامۆستایە

[1] سەرچەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی.... ل ١٦٠- ١٦٧. هەروەها ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری هیوا ژ ٣٣ ساڵی ١٩٦١دا بڵاوکراوەتەوە.

خەڵکی گوندی (تاوغە)و کوردی باش نازانێت و بۆ دێیەکی کوردی نێراوە،و کۆسپ و تەگەرەی زمان بوو کەدەبوایە منداڵە کورد بە عەرەبی بخوێنێ لە لایەکی تریشەوە کۆسپی جێگا پەیداکردن بۆ خۆی و قوتابیان بوو... لێرەدا چیرۆکگێرەوەی کەم شتزان لە رێگەی بیستنەوە زانیارییەکانی دەست دەکەوێ و ئەگەر لە ناو ئۆتۆمبیلەکە نەمێنێ هیچ نازانێ.. هەر بۆیە بۆی دەردەکەوێ و کە مامۆستا وەك مۆم دەوری لە وشیارکردنەوەی منداڵە جووتیارەکان و منالانی ئاغادا بێ جیاوازی دەبینێ.. ئەوەبۆ هاورێکەی روون دەکاتەوە کە (قوتابخانە بۆ هەمووانەو ژمارەی قوتابیانی لە (٨) سەفە بوو بە (پەنجا) تەنانەت لە دێیەکانی نزیکیشەوە منداڵە فەلاحەکان دەستیان کرد بە هاتنی. کوڕو کچ پێکەوە دەیانخوێند).... پاشان مامۆستا وەك شاکەسی چیرۆکەکە بەسەر هاتی خۆی دەگێڕێتەوە –سەختی ژیانی فەلاحەکان و ئەرکیان بووە هۆی ئەوەی باشترین و زیرەکترین قوتابی دەرهێنن. ئەمە کاری لە مامۆستا کرد، (هەرچی دەردەسەریم کێشابوو بەلامەوە بە هیچ دەرچوو لە چاو ئەم ستەمەدا باخەوانێکی دڵسۆز چەندی پێ ناخۆشە شەتڵ و نەمامە تازە گیرساوەکانی هەڵکەنێ من لەوم زیاتر لا ناخۆش بوو، بنیادەم رەنج لەگەڵ هەر شتێکا بکێشێ خۆشی ئەوێت نەخواستە منالْ کە نەمامی باخی ژیانن...) چیرۆکگێرەوەی کەم

شتزان هەموو زانیارییەکانی لە مامۆستاکەوە بیست و یەکسەر شەپۆلی هۆشی* بۆ منالی خۆی دەگەڕێتەوە کە باوکی زۆری پێ ناخۆش بوو شەتلە تازە لێ دراوەکان لە شوێنی خۆیان هەڵکێشن –ئالێرەدا چیرۆکگێڕەوە دەبێتە بەشداربوو دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستاو مژدەی پاڵەوان و جەنگاوەری پێ دەبەخشێ و ئۆتۆمبیلەکە دەگاتە (تاوغ) بە بە هەشتی دێرینی شاد دەبێ.... چیرۆکەکە کۆتایی دێت.. ئەگەر مامۆستا نەبوایە چیرۆکگێڕەوە هیچی سەبارەت ژیانی گوندو جووتیارو کوێخاو قوتابیان و ئەرکی قوتابیان نەدەزانی.

– لە چیرۆکی (نامەی سەر سنوور)دا هەست بە گێڕانەوەی دوو چیرۆکگێڕەوە دەکەین... یەکەم چیرۆکگێڕەوەی هەمان شتزان کە لە دەرەوە شتەکان دەبینێ (زۆر تر دڵم بە لای ئەو لاوە خوێن گەرمانەوە، بوو کە چەند هەفتەیەك بوو دەستیان دابووە تفەنگ و هێشتا چاویان باش نەکراوەتەوە لە شەڕی ناو شاخ و دارستان و لە فروفێڵی یاخییەکان شارەزانین...)[1] بەم جۆرە دەچێتە ناوەوەی چیرۆکەکەو رووداوو کەسەکانمان لە رێگەی راناوی یەکەمی بگۆی تاك یا كۆوە، پێ دەناسێنێ

* لە شوێنێکی تایبەتی و لە تەکنیکی گێڕانەوە لێی دەدوێن

[1] چیرۆکی نامەی سەر سنوور... ل ١٧٣ (سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی).

وئاگـاداری زانیارییەکانـە بـە پێـی شـوێن و کـاتی دیـاریکراو کـە سـەردەمی دامەزرانـدنی سـوپای میللییـەو بـەرگری لـە شۆڕشـی ١٤ی گەلاوێـژە. لەلایـەکی تریـشەوە لـەم چـیرۆکەدا هەسـت بـە چیرۆکگێرەوەی کەم شتزان دەکرێ کە لە رێگەی (نامە) یاخود بیستن و دیتنەوە زانیاری وەردەگرێ لە گۆشەنیگاوەو لـە رێگـەی شەپۆلی هۆشەوە یادی کەسەکان و مەشقی چەکداری دەکاتەوەو پەی بە یادەکان دەبات... لـە پـڕ لەسـەر سنوورەوە لـە رێگـەی کوردێکی رانك و چۆغە لەبەر نامەیەکی پـێ دەگات کـە نووسـرا بـوو (لەسـەر سـنووری کوردسـتانەوە بـۆ رۆژنامـەی...) ئـیتر لـە رێگــەی (نامــە)کــەوە ئاگــاداری ئازایــەتی جــەنگاوەران و بــرا بەرزانیەکـە(م)و (ح)ی هـاوڕێی، ئاگـادارو جـۆرو ژمـارەی چـەك و ورەی جـەنگاوەران دژی دەرەبـەگ و یـاخی بووەکـان دەبێتـەوە.. ئاگـاداری برینـداری فەلاحـەکان و تەقـەکردن و هێـزی بـەرگری میللی و هێزی فەلاحەکان پێکەوە: بەگـژ یـاخی بووەکانـدا چـوون و ئەنجام (م) بریندار دەبێ کە ژنەکەی سۆڤیەتیەوەو کۆرپەیەکی دەبـێ و دڵنیـا دەبـێ کـە ژن و کوڕەکـەی دەگرنـەوەو بـەرگری لـە جەمهوریەتەکە دەکـەن...) کە چیرۆکگێرەوە نامەکەی خوێندەوە دوو دڵـۆپ دڵـۆپی شـادمانی کەوتـە سـەر هـەردوو گلێنـەو حـەزی دەکرد ئەگەر بە باڵیش بێ بۆ لای (م) بفڕێ و تێر تێر هەڵی مژی و لـە شـوێنی ئـەو تـا رزگـاری شـاخەکان سـنوور بەرنـەدا ئـا بـەم

شێوەیە چیرۆکگێڕەوەی کەم شتزان لە ڕێگەی نامەوە.. هەموو زانیارییەکانی پێ دەگات و بەپێی شوێنی نامەکەو لە کۆتایی چیرۆکەکە دەردەکەوێت و چیرۆکەکە تەواو دەبێت و زۆرجاریش بەهۆی ڕاناوی کەسی سێیەمی نادیارەوە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوەو شوێنی لە ناوەوەی چیرۆك دەبێت و لەگەڵ دەست پێ کردنی چیرۆك و کۆتایی چیرۆکەکە دەردەکەوێت.

باسی دووەم:

## شێوازی گێڕانەوە لە چیرۆکەکانی (مارف بەرزنجی)دا

ئەگەر شێوەی گێڕانەوە لە میانەی جۆرەکانی چیرۆکگێڕەوەدا بریتی بێ لەوەی چیرۆکگێڕەوە چۆن و لە کوێوە تەماشای ڕووداوەکان دەکا؟ کە ئەمەش پەیوەندی چیرۆکگێڕەوەو گێڕانەوە ئاشکرا دەکاو ئەم پەیوەندییەش لەئاستی بینین و لە مەوقیعی چیرۆکگێڕەوە دیاری دەکرێ ئەوا قسەکردن لەسەر چەشنی گێڕانەوە تایبەتە بە چۆنیەتیەکی تری گێڕانەوەی ڕووداو لەسەر ئاستی فۆرم و شێواز... زۆر لە ڕەخنەگرانیش چەشنی گێڕانەوە بە مانای لێکۆڵینەوە لە پێکهاتەی زمانەوانی تایبەتمەندییە شێوازییەکانی چیرۆکبێژانی ناو یەك چیرۆك یا ڕۆمانە تا جیاوازییەکانی نێوان دەنگەکانی ناو گێڕانەوە دەربخات... دەشێ چەشنی گێڕانەوە ئەم پرسیارانە بخاتەوە چیرۆکگێڕەوە ئەو واقعیانە چۆن دەگێڕێتەوە کە دەیانبینی؟ ئایا وەك خۆی دەگێڕێتەوە یا کورتیان دەکاتەوە، بەشێوەیەکی هونەری دەستکاری و چارەسەریان دەکا؟ ئایا ڕێگە بە کەسەکان دەدا ڕاستەوخۆ ئازادانە بە دەنگی خۆیان قسە بکەن یاخود خۆی لە بری ئەوان قسە دەکات و دەنگی خۆی تێکەڵ دەکات.

بەگشتی چیرۆکگێڕەوە، نووسەر هەوڵ دەدا نێوانیەك لە نێوان خۆی و ڕووداوەکە دروست بکات و شێوازێکیش بۆ قسەکردنی کەسەکانی هەڵدەبژێرێ. لێرەدا چەند چەشنێك لە شێوازی گێڕانەوە پەیدا دەبی"[1]

یەکەم: چەشنی شێوازی ڕاستەوخۆ بەزۆری ڕاناوی (مـن) بەکاردێ.

دووەم: چەشنی شێوازی نا ڕاستەوخۆی بە زۆری ڕاناوی (ئەو) بەکاردێت.

سێیەم: چەشنی شێوازی نا ڕاستەوخۆی ئازاد.

هەر ئەم جۆرە دابەش کردنە بە لای ڕەخنەگری فورمالیستی روسی (تۆمانشفسکی) دوو جۆرە شێوازی گێڕانەوە دەست نیشان دەکات ئەویش:

١- گێڕانەوەی بابەتی Objective. لێرەدا نووسەر هەموو شتێك دەزانێت تەنانەت بیرەکانی شاکەسیش.

[1] تقنيات السرد الروائي...... يمنى العيد. ص ٨٠.

٢- گێڕانەوەی خودی Subjective. چیرۆکگێڕەوە لە گۆشەنیگای چیرۆکگێڕەوە یاخود گوێگر شوێن ڕووداوەکە دەکەوێ[٢].

لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا دوو جۆرە شێوازی گێڕانەوە بەکار هاتووە کەشێوازی گێڕانەوەی (بابەتی)و شێوازی گێڕانەوەی (خودی)یە، لێکۆڵینەوە لە چیرۆکەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە هەندێ چیرۆك بەر شێوازی بابەتی کەوتووە وەك چیرۆك (ئاوازو کەباب)و (گای پیرۆز)و (پەیکەرەکەی گاورباغی) هەندێکی تریشیان بەر گێڕانەوەی خودی کەوتووە وەك (شەتل)، (نامەی سەر سنوور)، (جەژنێکی شادی)، (سەر لە بەیانی نەورۆزێك) زۆر جاریش گێڕانەوە بەستراوە بە شوێنی هەر یەك لە جۆرەکانی چیرۆکگێڕەوە (هەموو شتزان، هەمان شت زان،کەم شتزان) لەسەر ئاستی ڕووداوی چیرۆکەکە (جا شێوازی بابەتیش لە ڕووی شوێنی چیرۆکگێڕەوەو پەیوەندی بە کەس و ڕووداوەکان و چەند ئەو زانیارییە دەربارەیان دەزانێت... یەکێك لە تایبەتیەکانی شێوازی گێڕانەوەی (بابەتی) لە پێشکەش

[٢] نقريه المنهج الشكلى –توماشقسى والشكلانين الروسى– ترجمه ابرهيم الخگيب. بيروت: ١٩٨٢، ص ١٨٩، بروانه: الصوت الاخر. فاچل پامر..... ص ١٨٢.

کردنی کەس و ڕووداوەکان ئەوەیە)[1] لە وێنەگرتنی واقع نزیک دەبێتەوە بە تایبەتی (بەگوێرەی بینەری دەرەوە واتە خوێنەر جگە لەوەی دەبێتە هۆی هەست کردنی چیرۆکنووس بە دوورکەوتنەوەی لە کەرەستەی چیرۆکەکەی لە ڕووی سۆزو هەستەوە، بەم جۆرە کەسەکان وا لە خوێنەر دەکەن بڕوا بە بوونی ڕاستەقینەیان بێنن)[2].

– لە چیرۆکی (ئاوازو کەباب) چیرۆکگێرەوە لە دەرەوە ڕووداوەکان دەبینێ و لە ڕێگەی شاکەسەکان (فلامورزو میرزا) بە شێوەیەکی واقعی ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە.. ئیتر کە خوێنەر یا گوێگر چیرۆکەکەی گوێ لێ دەبێ لە ناو چایخانەی گەڕەك و شەڕی میرزاو جەمول و دادگاکردنی میرزاو مانەوەی لە بەندیخانەو دەرچوونی و گۆڕانی لە کەسێکی شەڕانی بۆ کەسێکی هێمن و دۆزینەوەی کارو خستنە لاوەی خەنجەرو تفەنگ بۆ خۆشی ژیان –ئەمانە بە شێوەیەکی بابەتیانە چیرۆکگێرەوەی هەموو شتزان بۆمان دەگێڕێتەوە بەسەر هەموو لایەکی چیرۆکەکەشدا زاڵە... لەلایەکی ترەوە واقعی کۆمەڵی

(1) بینای هونەری چیرۆکی کوردی ... پەرێز .... ل ٢٤٦.

(2) النقد التكبيقى التحليلي –د. عدنان خالد عبدالله ، ص ٦٠.

کوردەواری و چینەکانی کۆمەڵ لە جووتیارو فەلاحەحان و ئاغاو دەرەبەگ و پارێزەرو مامۆستاو هەژارو دەوڵەمەندو ئایدلۆژی لە ناو چیرۆکەکانی مارف بەرزنجی بەشێوەیەکی واقعی دەرکەوتووەو چیرۆکگێرەوە، کە خودی نووسەرە بێ پێچ و پەناو بە شێوەیەکی بابەتی و خودی چیرۆکەکان پێشکەش خوێنەر دەکات.

- لە ئەنجامی گۆڕانی شێوازی گێڕانەوەو کەمبوونەوەی دەسەڵاتی چیرۆکگێرەوە جۆرە شێوازێکی تر هاتە کایەوە ئەویش شێوازی (گێڕانەوەی خودی) بوو... بە هۆی گۆڕانی شوێنی چیرۆکگێرەوە لەسەر ئاستی رووداوەکانەوە واتە لە دەرەوە چیرۆك بۆ ناوەوەی چیرۆکەو تێکەڵ بوون لەگەڵ کەس و رووداوەکانی هەر بۆیە دەوری چیرۆکگێڕەوەی هەموو شت زان بووە. چیرۆکگێرەوەی هەمان شت زان و چوونە ناو هەست و هۆشی کەسەکان و ماوەدانیان بە رووبەڕووبوونەوەی خوێنەرو بەستنەوەی بە وەرگرو شوێنی لەسەر ئاستی تێکست و لەسەر ئاستی رووداوی چیرۆك شوێنی ناوەوەی چیرۆکە چونکە شێوازی گێڕانەوە شێوازێکی خودییە.

- ئەم جۆرە شێوازە لەچیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا لە (شەتڵ)و (جەژنێکی شادی)، (سەر لە بەیانی نەورۆزێك) رەنگی

داوەتەوە، چیرۆکگێرەوەی هەمان شت زان لەسەر ئاستی تێکست و ڕووداوەکە ڕووداوەکەمان لە ناوەوە بۆ دەگێڕێتەوە، و بە زاری یەکێ لە کەسەکان و تێکەڵ بوونی خودی چیرۆکگێرەوە لە (جەژنێکی شادی)دا هەموو ئازارەکان گرتن و زیندان و چۆنیەتی گوزەرانی زیندانیەکان و یەکگرتنی زیندانیە سیاسیەکان بۆ دەگێڕێتەوە لە چیرۆکی (سەر لە بەیانی نەورۆزێك)دا چیرۆکگێرەوەی هەمان شتزان لە دەرەوەی چیرۆکە دیمەنەکانی خۆر کەوتنی نەورۆز و جوانی شوێنە تایبەتییەکانی سلێمانی و دەوروبەری باس دەکات دەچێتە ناوەوەی ناو چیرۆکەکەو یادگاری دوێنێ و ئەمڕۆی و دوێنێ... هەر لەم چیرۆکەدا هەست بە دوو جۆرە گێڕانەوە دەکەین... کەسێك لە ناوەوە ڕووداوەکان و شتەکان دەگێڕێتەوەو کەسی دووەم چیرۆکگێرەوەیە لە گۆشەنیگای کەسەکانەوەە هەستەکان دەگێڕێتەوە (چ ژیانێکی خۆش بووە جاران.. گڕی ئاگری دارو بەردو گۆشتی برژاوی لەزمە دراوی مەڕە کێوی و کەوو کەروێشکێك و نان و دوو شتانەی هەنگوینی ناو پەلی داری سەر لوتکەو لاپاڵی چیاکان...) (چەرخ چۆن گۆڕاوە.. ژیان گران بووە... باوك و دایك پیا ڕاناگەن چەرخ و باج و ڕۆژ ل ڕۆژ زۆرتر بووە... ئەوسا پۆلیس وا زۆر چەقاوەسوو و شەڕفرۆش نەبوو... ئێستا لەشار دەردەچێت ناوت ئەنووسن، دێیتەوە ناوت ئەنووسن، -مێوانێ

دیٚ ناوی ئەنووسن... ئەچیتە میوانی هەر ناوت ئەنووسن وەك هەموو پیاو خراپ بین).

لە ناو چیرۆکەکاندا جۆرە شێوازێکی تر دەبینن ئەویش تێکەڵی دوو شێوازی گێڕانەوەیە چیرۆکگێڕەوەی هەمان شتزان لە یەك چیرۆکدا لەگەڵ چیرۆکگێڕەوەی کەم شتزان دەبێت و بەشێوازێکی خودی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە چونکە شوێنی هەر لە ناوەوەی چیرۆکدا دەبێت و لەسەر ئاستی تێکست و رووداوەکانە وەك لە چیرۆکی (شەتڵ)دا لەسەر ئاستی رووداوەکە لە دەرەوە بۆ ناوەوە هەنگاو هەڵدێنیٚ کە بە هۆی زانین و بیستن دوو کەسەکانی ناو چیرۆکەکە رووداوەکان تیٚ دەگات و کاتی لە کەم زانینەوە خۆی دەوردەبینیٚ کە هەست دەکات فەلاحەکان منداڵەکانیان لە قوتابخانە دەرهێنا وەك شەتڵ دەربێنن لێرەدا چیرۆکگێرەوە. دەوری خۆی دەردەخات (ئەزانی چیم کەوتەوە یاد کە منداڵ بووم لەگەڵ هاورێکانمان بە دزیەوە ئەچووینە ناو باخچەکە باوکم شەتڵە تازە لیٚ دراوەکانمان لە شوێنی خۆیان هەڵئەکێشا کە لە ناکاو باوکم بەسەردا ئەهات هاواری لیٚ هەڵئەستا وەك باوکە رۆبکا ئەمجا ئەکەوتە سەرمان بەڕاکردن و تا منی دەست ئەکەوت... چاك چاك سەرو گوێلاکی ئەکوتام... ئێستا ئەزانم کە باوکم ناهەقی نەبوو چونکە رەنجی لەگەڵ شەتڵ

و نەمامـەکانا کێـشا بـوو، هیـوای دوا ڕۆژی بـوون). لەلایـەکی تریشەوە دەڵێ (خۆم پێ ڕاگیر نەکراو لام کردەوەو دەستم بە زۆر بۆ درێـژ کـرد وتم: بـرادەر! تـۆش پاڵـەوانێکی، تـۆو هـاوڕێی تـۆ جەنگاوەری شاراوەن...).

– بەگـشتی لـەناو چـیرۆکەکانی مـارف بەرزنجیـدا دوو شێوازی گێڕانـەوە بینـرا ئەویش شێوازی گێڕانـەوەی (بابـەتی و خـودی) بـووە بەسـتراوە بـە شـوێنی هـەر یـەك لـە جۆرەکـانی چیرۆکگێڕەوەی (هـەموو شتزان و هـەمان شـتزان و کـەم شـتزان) لەسـەر ئاسـتی ڕووداوی چـیرۆکەکە و لەسـەر ئاسـتی تێکـستدا دەوریـان بینیـوەو ئـەوەی سەرنج ڕادەکێـشێ مارف بـەرزنجی لـە چیرۆکەکاندا ئاوڕی لە شێوازی بابەتی داوەتەوە.

# خشتەی تەکنیکی گێڕانەوە

| ژ | چیرۆکەکان | شوێنی چیرۆکگێڕەوە | جۆری چیرۆکگێڕەوە | جۆری بینین | جۆری راناو | شێوازی گێڕانەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئاوازو کەباب | لە دەرەوە | هەموو شتزان | لە دواوە | راناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) | بابەتی |
| ٢ | گای پیرۆز | لە دەرەوە | هەموو شتزان | لە دواوە | راناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) | بابەتی |
| ٣ | پەیکەرەکانی گاوربانی | لە دەرەوە | هەموو شتزان | لە دواوە | کەسی سێیەمی تاك (ئەو) | بابەتی |
| ٤ | جەژنێکی شادی | لە ناوەوە | هەمان شتزان | لەگەڵ | کەسی یەکەمی بگۆی(من)وکۆی (ئەو) | خودی |
| ٥ | سەر لەبەیانی نەورۆزێك | لەناوەوە | هەمان شتزان | لە دەرەوە | کەسی یەکەمی بگۆی تاك (من) | خودی |
| ٦ | شەتڵ | لە ناوەوە | کەم شتزان | لە گەڵ | کەسی یەکەمی بگۆی تاك | خودی |
| ٧ | نامەی سەر سنوور | لە ناوەوە | کەم شتزان | لە دەرەوە | کەسی یەکەمی بگۆی تاك | خودی |
| ٨ | بەسەرهاتی قوتابیەکی پۆلی چوارەمی حقوق | لە دەرەوە | هەموو شتزان | لەدواوە | راناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) | خودی |
| ٩ | مەلا برایم | لە ناوەوە | هەموو شتزان | لەدواوە | راناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) | بابەتی |
| ١٠ | من و براکەم | لە ناوەوە | هەمان شتزان | لەگەڵ | کەسی یەکەمی بگۆی (من)و کەسی یەکەمی کۆ (ئێمە) | خودی |
| ١١ | حەمەدەفەندی سەرسام | لە دەرەوە | هەموو شتزان | لە دواوە | راناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) | بابەتی |

تەوەری سێیەم:

## مەبەستەکانی گێڕانەوە لەچیرۆکەکانی ( مارف بەرزنجی )دا

چیرۆکگێڕەوە لە گێڕانەوەدا مەبەستی گەیاندنی چیرۆکەکەیەتی. بە وەرگر[1]... بە هۆی وەسف و گفتوگۆوە تا بگاتە خوێنەر یا گوێ گر.

هەر لە مێژەوە مەبەستی گێڕانەوە وەسف و گفتوگۆ بە یەکێک لە تەکینەکانی گێڕانەوە دانراوە (چیرۆکگێڕەوە کاتێک بە کاری وەسف کردن دەست پێ دەکات واز لە گفتوگۆ دەهێنێت بۆ کەسەکان بۆ ئەوەی گوزارشت لە خۆیان بکەن وەیان چاودێری پرۆسەی گواستنەوەی گفتوگۆیەکە دەکات لە پاڵ راستکردنەوەو هەڵبژاردنی جۆری ئەو گفتوگۆیەی لە گێڕانەوەکەدا دەبێت)[2].

یەکەم: وەسف:/ بە واتای باس کردنی دیوی دەرەوەی کەس و شتەکان و شۆڕ بوونەوەش بۆ ناخی کەس و شتەکان بەپێی

[1] بینای هونەری .... ل ٢٥٩.

[2] البناو الفنی فی الروایه التاریخیه العربیه. خالد سهر محی الدین الساعدی: ص ٩١.

گۆڕانی شێوازی گێڕانەوە چونکە (لە شێوازی گێڕانەوەی بابەتیدا وەسف هۆیەکە لەهۆیەکانی بینا بە دەست چیرۆکگێرەوەی هەموو شتزانەوە کە بە هۆی ئەوەوە چوار چێوەی کات و شوێنی رووداوەکان و رەفتارو رەوشتی کەسەکان دیاری دەکات و لە شێوازی گێڕانەوەی خۆیدا تێکەڵ بە روانینی کەسەکان و باری دەروونیان دەبێت[٣].

زۆر جار گێڕانەوەو وەسف بەیەکدا چوونێکی تیا روودەدات (کە دەتوانین ناوی لیّ بنێین وێنەی گێڕانەوە، کەشتەکان لە حاڵەتی جووڵانەوە پیشان دەدات کەچی وێنەی وەسفی شتەکان لەحاڵەتی نەبزواندا پیشان دەدات)[٤].

لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا* ئەم جۆرە وەسفانە دەبینرێن. وەسفی کەس و شوێنەکان.. لە چیرۆکی (ئاوازو کەباب)دا کە گێڕانەوەیەکی بابەتییەوە چیرۆکگێرەوەی هەموو شتزان وەسفێکی تایبەتی کەسەکان و شوێنەکان دەکات.. لەم جۆرە

[٣] البناو الفنی لروایه الحرب ف العراق —دز عبدالله ابراهیم ص ١٨.

[٤] بناو الروایه —د. سیزار قاسم– بیروت ١٩٨٥: ص ١١٢.

* سەرچاوەیەکی سەرەکی شیکردنەوەی چیرۆکەکان (سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەمیدە) هەر بۆیە بۆ چیرۆکەکانی تەنیا ئاماژە بە لاپەڕەی چیرۆکەکان دەکەین (ش. ر).

چیرۆکەدا (ئاوازو کەباب) چیرۆکگێرەوە سەرەتا وەسفێکی گشتی هەردوو کەسانی ناو چیرۆکەکە دەگێڕێتەوەو پاشان دێتە سەر وەسفی تایبەتیان: (ئەم جووتە کوڕە، فەلامورزو میرزا وەك کەڵەشێری جەنگی گەڕەکەمان بوون، بە گیانی یەکتر سووربوو...) ل ١٤٦. لە وەسفی تایبەتیان لایەنی فیزیکی و دیوی دەرەوە:

" فەلامورز چوار شانەیەکی تێکسمراوی گۆشتن و دەست و مەچەکێکی ئەستوورو پەنجەکانی ئەتوت لە پۆڵا داڕێژراون. بەهێزداری و تەوانایی ناوبانگی دەرکردبوو دوو چاوە گەورە رەش و مەنگەپڕ ئارامەکەی خۆڕاگرتن و نەبەزیی تیا ئەخوێنرایەوە...(ل١٤٦)

لە وەسفی (میرزا)شدا.

"میرزا درێژێکی کەم گۆشتی دەماردار پێست سوری چاو کەمێ شین بۆ چاپۆکی لە پشیلەی ئەکرد، دەس وەشێن بوو گەلێ کەسی سەر شکێن کردبوو زۆرتر بەوە کە بەزەیی بە خوار دەسی خۆیدا نەئەهاتەوە... (ل١٤٦).

- بەم شێوەیە چیرۆکگێڕەوەی هەمووشتزان هەردوو کەسەکە بە ئازایەتی وەسف دەکات بەڵام میرزا بەلای خراپەدا دادەشکێنێ.

- چیرۆکگێڕەوە بە شێوەیەکی زۆر چڕو پڕ وەسفی (شوێنەکان) دەکات و دیمەنەکان بەرجەستە دەکات: (چایخانە گەورەکە کە ئەکەوێتە ناوەڕاستەوە، لای خۆرئاوایە چۆڵە دەشتێکە چەند داربییەکی سەوزی جوانی تێدایە... جۆگەلە ئاوێکی تاسەر چەمەنتۆ کراویش بە بەردەمیا ئەڕوا... نێوەندی دارەکانیش بەگوڵ و گیای هاوینە پڕ ئەکرێتەوە. تەنیا شۆرەبیەك هەیە لە نزیك جۆگەکەوە بە ئەستووی کعلەبێلێ ئەبێ دوورم چووە. بە ئاسمانا لەسەرەوە لق و پۆپە سەوزەکەی وەك پرچی کچێکی شۆخ بە گرژو خاوی هاتۆتە خوارەوە تا نزیك داوێن) لە وەسفی ناوەوەی میرزا (چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك.. خوێنێکی گەشی هاتە رومەتە زەردهەڵگەڕاوەکەی...)ل١٥٠.

- لە چیرۆکی (گای پیرۆزدا) چیرۆکگێڕەوە وەسفی تایبەتی مامۆستا وا دەکات: (مامۆستای قوتابخانەکە خوێندەوارێکی وریاو زرنگ و مێشك کراوە بوو)ل ١٥٣. چیرۆکگێڕەوەی هەمووشتزان بە ناخی (شێخ)دا شۆڕ دەبێتەوەو وەسفی ناوەوەی

شێخ و باری دەروونی دژی مامۆستا دەکات: (شێخ لە مەراقا هەر تـووکی سمێلـی خـۆی ئـەبرد بـە دەمـار پیـشی ئـەخوارد: بـەڵام دەردی دڵی خۆی بۆ خەڵکەکەی دەورو پـشتی دەرنەئـەبڕی، هـەر بە ئاخ و ئۆف و های و هوو بەبا ئەدا) ل١٥٣.

- لەوەسفی چاپەزی تەکیە وا وەسفی کەسەکانی ناو تەکیـە دەکات (خەلیفە پڕ چینە ورگنە نەوسنەکان سەریان هـاتبووە ژان و سەرچاوەیان گرژ بوو بوو بۆ چای سەنگین)ل ١٥٤.

(حەمـەی مەیتـەر، چـەناگە کوسـتەکەی بـاداو دەمەرەقەکـەی وەك قاچی دایە یەکاو سەرە گیزو کەلەنگ دارەکەی بۆ لەرانـدەوە).... ل١٥٥.

(کوێخـای میـوان کـە سـەرو تەپلەیـەکی دامـەزراوەو ریـشێکی لـە مەکینـەدراوی پێـوە بـوو لـە ریـزی گـەنمی تـازە درەوکـراوی ئـەکرد... دەسـتێکی بـرد بـۆ دەسەسـڕی سـوورەکەی ملـی و هاوردیەوە بەسەر کوشتەکی خەنجەرە مشتووماهییەکەیاو چاوو برۆ پەیوەستەکانی لەسەرخۆ هـەڵبڕی و بە شەرمی حزروورەوە کارامەیی خۆی نواند) وەسفەکان لایەنی خراپەی کەسەکانن.

- لە چیرۆکی (شـەتڵ)دا مامۆستا کەپاڵـەوانی چیرۆکەکەیە وەسفی رێگاو بان و دیمەنەکەیمان بۆ بەرجەستە دەکات.

(ڕێگای قیرتاو کراوەکە تا چاو هەتەر ئەکا درێژو باریك ئەبۆوە. لە پێش ئۆتۆمبیلەکە وەك رەشمار کشابوو، هەوا گەرم و قرچەی هاوینی گەرمیان و سەردەمی خەرمان، ئەملاو ئەولای ڕێگاکەمان قایمەو پەرێزی گەنم و جۆ، کۆمەڵ کۆمەڵ سەپان و کوڵ کێشان بە فەرەنجی سپییەکان کڵاوە قووچە کانیانەوە دەس بە داسەوە شان و بالیانا ئەوە شان و کێشەی قرچەیان ئەکرد، پۆل پۆل رەوی کور کور هەڵفرین و ئەنیشتنەوە لەبەر زۆری ناو بە ناو سێبەرێکی تەنکیان ئەخستە سەر زەوی) ل١٦٣. هەروەها وەسفی ناوچەوانی ئاغا دەکات وەسفی قوتابخانەی دەکات.

– لە چیرۆکی (جەژنێکی شادی)دا چیرۆکگێرەوە کە شوێنی کەسەکەی گرتووەو، لە دەرەوە هاتووەتە ناوەوەو جۆری هەمان شتزانە لە زیندانەدا... کرێکارێك دەبینی وا وەسفی گشتی و تایبەتی دەکات.

(کرێکارێکی کەیان سەرنجی راکێشابووم. پیرێکی بە ساڵاکەتووی شرۆڵ روومەتی لە تۆپێکی فشەوە بووی ئەکرد و دەم و دانی کەلاوەیەکی وێرانی ئەهێنامەوە یاد. دەماری لاقەکانی رەق ببوون. زۆرتر لەلاقی دەستکردیان ئەکرد. لە هەنگاو هەڵێنانا کەتەکانی ئەدا تا خێراتر بڕوا رەوتی قەلەباچکەی ئەهێنامە پێش چاو، پوزەکانی گرێ گرێ

وەستابوون... دیار بوو ئاوی قاچی داهاتبوو، پێیەکانی زل و پان و لە تایەی پەنجەر بووی ئۆتۆمبیلی ئەکرد..)ل ١٧٠.

- لە چیرۆکی (پەیکەری گاورباغی)دا چیرۆکگێڕەوەی هەموو شتزان لە دەرەوە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوەو خۆی دەخاتە جێگەی کەسی ناو چیرۆکەکە بەشێوەیەکی بابەتی وەسفی دووکاندارەکەی هاوڕێی دەکات کە لە بازاڕی (قۆرییە)یەو دیمەنی دووکانەکە وێنەگر دەکات:

(دوکانێکیبچووکی سەوزە فرۆشی، چوار پێنج سەبەتەو دوو سێ قیر تەبەقی کەوەرو توورو پیازو کولەکەو بامێ و تەماتە لەسەر هەڵمنراوە لە ناوەڕاستی کەمەری دووکانەکەیشتەوە تەرازوویەکی کۆن هەڵواسراوە. لەملاو لەولایەوە چەند سەنگێکی رەسمی لەگەل چەند خشت و کلۆیەکا...)ل ١٧٩.

لە وەسفی (سەیدە ئەفغانی مرکە)دا چیرۆکگێڕەوە وا وەسفی دەکات:

(سەیدە ئەفغانی مرکە، مێزەرێکی چویتی و چاوێکی رەش کراو بەکل و ریشێکی سوورو رەشی بەشانەوە کراوێك رێزەدانێکی لەگەڵ تاکە دانێکی ئاڵتوودەدا، کەم دوو کەنار گرتوو لە کۆڕی خەڵك لە ژوورێکی تاریك و دوو دیودا)

- لە چیرۆکی (سەر لە بەیانی نەورۆزێك)دا چیرۆکگێڕەوە لەم چەشنە وەسفی شەوانی زستان دەکات (شەوانی زستان کە شار تارای زیوینی ئەپۆشی بەفر کلوکلو وەك فریشتە ئەهاتە خوارەوە یا وەك کردگار تاپاش دڵی پاك و پڕ سۆزی ئێمە بکا بە دراوی تازەی سکەی لە رەنجی کەس نە دزراو شان بەشان بەسەر شەقامە نەسرینیەکاندا تێمان ئەچریکاند لە قەتارو هەوری لار(.......).

- لە چیرۆکی (بەسەر هاتی قوتابیەکی پۆلی چوارەمی حقوق)دا چیرۆکگێڕەوە وا وەسفی کۆڵانێك دەکات (خانوویەکی لەسەر شێوەی کۆن، دەرگایەکی دوولایی کۆن و بێ رەنگ بە کوڵ میحنی ئاسندا کوتراو لە چەشنی چەکۆش دەسکێکی لێدانی پێوەیە، کە چووینە ژوورەکانی خوارەوەی ژێر زەمینێك و چەند هۆدەیەکی زۆر....).

- لە چیرۆکی (مەلا برایم)داو چیرۆکگێڕەوە وا وەسفی دەرەوەی مەلا برایم دەکاو دەڵێ: "پیاوێکی مەیلەو کورت بوو ئەسمەرێکی روو ئاولاوی، چاوەکانی کل و سورمەی نەئەویست، ریشوی جامەدانییەکەی بەولاو بەولای ناوچەوانیدا ئەهاتنە خوارێ، گۆشەگیر کە دوو بوو".

- بەگشتی لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا زیاتر گرنگی بە وەسفی کەسەکان و لایەنی فیزیکی و شوێنەکان و وەسفی زستان داوە. تا ناوەوەی کەسەکان.

**دووەم: گفتوگۆ**: هۆیەکە لە گێڕانەوەو لە بینایی چیرۆکدا ئەرکی دەربڕینی بیروڕاو هەڵوێستی کەسەکە دەردەبڕی و دەبێتە دوو بەشەوە:

١- دایەلۆگ.

٢- مۆنۆلۆگ (خۆ دواندن).

- دایەلۆگ: گفتوگۆی نێوان دوو کەس یا زیاترە.

**مۆنۆلۆگ**: کە بە زۆری لە چیرۆکی نوێدا بەکار دێت، بەمەبەستی دەرخستنی دیوی ناوەوەی کەسانی چیرۆکەکەیە... واتە دیوی نەستی -لاشور- کەسەکە بەکاردێت[١].

بە واتایەکی تر مۆنولۆگ: ئەو هونەرەیە کە بە مەبەستی پێشکەش کردنی دیوی ناوەوەی کەسەکان بەکار دەهێنرێت.[٢]

[١] چیرۆکی نوێی کوردی -حەسەن جاف- هەولێر ١٩٨٥، ل ٨٧.

ئیتر لەبەر خۆیەوە، لە دڵەوە لەگەڵ خۆیدا، کەوتنە قسەکردن بەکار هاتووە[٣].

- رۆبرت همفری لە کتێبی (تیار الوعی)دا کەباسی مەنەلۆگ دەکات، دەیکات بە دوو بەشەوە:

١- مەنەلۆگی ناوەوەی راستەوخۆ.

٢- مەنەلۆگی ناوەوەی نا راستەوخۆ.

بە گشتی لە چیرۆکەکەدا چوار مەنەلۆگی ناوەوەی دەبینرێ

١- مەنەلۆگی ناوەوەی راستەوخۆ.

٢- مەنەلۆگی ناوەوەی نا راستەوخۆ.

٣- مەنەلۆگی (تەداعی).

٤- شەپۆلی هۆش (تیار الوعی).

---

[٢] تیار الوعی فی الروایه الحدیپه – روبرت همفری– ترجمـه: د. محمـود الـربیص گ٢. مـصر ١٩٧٥: ص ٤٤.

[٣] لێکۆڵینـەوەی کورتـە چـیرۆکی کـوردی لـە کوردسـتانی باشـووردا ١٩٧٠– ١٩٨٠ –ئـیبراهیم قـادر– ١٩٩٧: ل ١٩٤.

١- مەنەلۆگی ناوەوەی راستەوخۆ: لە خوێندنەوەی چیرۆکەکە ئەو چەشنە مەنەلۆگییەکە کە گوێی نادرێتە دەس تێوەردانی نووسەرو گوایە گوێگرتییە[٤] بەڵکو کەسەکە تەنانەت لەگەڵ خوێنەریشدا قسەناکا، بە کورتی مۆنۆلۆگ بە شێوەیەکی نارێك پێشکەش دەکرێ. بەگشتی لە کاتی خوێندنەوەی چیرۆکەکە (بەهیچ کلۆجێ هەست بەوە ناکەین کە نووسەرو گوێگرو ئێمەی خوێنەر لە کایە هەین بەڵکو لە ناخەوە باوەڕ دێنن کە ئەو قارەمانە بۆی دەدوێ نە کەسێك هێناویەتە زمان و نەمەبەستیش ئێمەیە گوێی لێ بگرین و شتێکیان پێرابگەیەنی»[٥].

٢- مۆنۆلۆگی نا راستەوخۆ: ئەو جۆرە مەنەلۆگەگەیە کە لە بری راناوی تاکی یەکەمی کۆ (من) راناوی تاکی کەسی دووەم و سێیەمی تێدا بەکار دەهێنرێت: (تۆ، ئەو) واتە بە پێچەوانەی راستەخۆ ئەمیان (ناڕاستەوخۆ) ئەو ئیحایە دەدابە خوێنەر (کە خۆشی و نووسەریش لە کایەدان، جگە لە وەسف کردن و

[٤] تیار الوعی... ص ٤٤.

[٥] رۆشنبیری نوێ. ت ٦٣ بەغدا ١٩٧٧. ل ٥ (شێوەکانی تەکنیك لە چیرۆك سالانی دوای ١٩٧٠- حسین عارف).

لێکدانەوەی پەیوەندی نێوان شتەکان و یەکێتی یان و هۆیەکانیان و هەست کردنیان بە واقعیان تیادا بەکار دەهێنرێت[1].

– بەگشتی لە چیرۆکەکانی شێخ مارف بەرزنجیدا دەتوانم بڵێم لە سەرجەم چیرۆکەکاندا تەکنیکی (گفتوگۆ) کە هۆیەکە لە گێرانەوەی بینای کەسەکان وئەرکی دەربرینی بیروراو هەڵویستیان دەردەخات، دەبینرێت و گفتوگۆش یا لە نیوان دوو کەس، یا زیاتر، دروست بووە بۆ نموونە: لە چیرۆکی (ئاوازو کەباب)دا گفتوگۆ لە نێوان فەلامورز و میرزا لە کاتێکدا میرزا لە گرتوخانەیە فەلامورز. دەبێتە کەفیلی و پێی وت:

(ئەگەر بەڵێن ئەدەی واز لە رەفتاری شەڕاویەکەی جارانت بێنی وا ئەبم بە کەفیلت لەبەندیخانە رزگار ئەبی!)

(میرزا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و وەڵامی دایەوە وتی (سوپاست ئەکەم ئەگەر پیاو بم بەسمە).

[1] تیار الوعی فی الروایە الحدیپە –روبرت همفری– ص ٤٤– ٤٩ هەروەها: (گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ. ت ٦٣ بەغدا ١٩٧٧ ل ٦– ١٨. شێوەکانی تەکنیك چیرۆکی ساڵانی دوای ٩٧٠ حسین عارف.

- له چیرۆکی "گای پیرۆز"دا کۆمەڵێ وتوویـژ لەنێوان شێخ و دەسـو پێوەنـدەکانی وەك (مەیتـەر، کۆڵکـە، کوێخـا، حەمـەی مەیسەر، کۆڵکە مەلا)[٢] ئەمانە لەگەڵ مامۆستا.

- لـە چیرۆکی (شـەتڵ)دا گفتوگـۆ لـە نێـوان دوو ئەفەنـدی پاشان نووسەر (چیرۆکگێرەوە) روویداوە.

- لـە (جـەژنێکی شـادی)داگفتوگـۆ لـە نێـوان شـاکەس لـە زینـدان و لەگـەڵ کرێکارەکـانی کـە ژوور لـە حەوشـەی زیندانەکـە دەکەن[٣].

- لـە (پەیکـەرەکانی گاوربـاغی)دا گفتوگـۆ لـە نێـوان (وسـوو موڵڵا)[٤]یە.

- لە (سەر لە بەیانی نەورۆزێك)دا گفتوگۆی نێوان (شاکەس و کورەکەی پۆڵا)[٥]یە.

(٢) بڕوانە سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی، لاپەرە( ١٥٤- ١٥٥- ١٥٦- ١٥٧).
(٣) بڕوانە سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی، ل ١٧٠.
(٤) بڕوانە سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی، ل ١٨٦- ١٨٧.
(٥) بڕوانە سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی، ل ١٩٣- ١٩٤.

بەکارهێنانی مۆنۆلۆگی ناوەوە بە هەموو جۆرەکانیەوە بە پێی شوێن و ناوەوەی کەسەکانەو بیرکردنەوەیان و دوان لەگەڵ خۆیاندا لە هەندێ لە چیرۆکەکاندا دەست نیشانی دەکەین کەناخی شاکەس یا کەسەکان دەردەخات*.

لە چیرۆکی (گای پیرۆز)دا[1] شێخ کە (شاکەسە لە رێگەی مۆنۆلۆگی) راستەخۆوە خۆی دەدوێنێ و قسەکانی لە دڵەوە دەکات: (لە دڵی خۆیا ئەیوت: تازووە جارێك! دەبڵێ: تا بە تەقەڵێك ئەدوورێتەوە نەی گەینمە کلافەك). شێخ لە داخی مامۆستاو فەلاح (رەنجبەرەکانی کە هاتووچۆی مامۆستایان بە شەو دەکرد کەوتە گومان: (ئەو شەوە نەیتوانی وەك جاران بنوێ لە ژێر لێفە سوورەکەیەوە هەر ئەم لاو ئەولای ئەکرد تا بەرەبەیان ئەوسا خەو بردیەوە) لەلایکی ترەوە لەو تەکیەی شێخدا مامۆستا لە قسەکانی شێخ ومەلاو دەستو پێوەندەکانی حەپەسا بەڵام ددانی بە خۆیان گرت و لە سەرخۆ هەڵسا لەناو ئەو کۆشرپوشێتە خۆی رزگار کرد (بەدەم رێوە لەبەر

* بە گشتی لە سەرجەم چیرۆکەکاندا مۆنۆلۆگی راستەوخۆیە هەیە قسەکەر چیرۆکەکەی ئاراستەی وەرگری دەکات.

[1] چیرۆکی گای پیرۆز، ل ١٥٣– ١٥٩.

خۆیەوە هەر ئەیوت گای پیرۆز... گای پیرۆز لەهیندستانیش گا ئەپەرستن...).

لە مۆنۆلۆژی نا راستەوخۆدا کە ئیحا بە خوێنەر یا نووسەر دەدا کە لە کایەدان.. ئەوەتا لە چیرۆکی (شەتڵ) ١٦٤دا چیرۆکگێڕەوە وا ناخی شاکەس دەخاتە روو (دڵنیاش بن منداڵەکانی ئاغا شوێنی باوکی خۆیان ناگرنەوە، ئەوەتە بەبەر چاوی خۆتانەوە دیوەخانەکەی ئاغا بووە بە قوتابخانەو جارێکی تر نابێتەوە بە دیوەخانەکەی جاران کە ئێوە لێی ترساون).

شەپۆلی هۆش:

لە پاڵ تەکنیکەکانی گێڕانەوە مارف بەرزنجی یەکەم چیرۆکنووسە لە نیوەی دووەمی پەنجاکانداناوڕی لە تەکنیکی شەپۆلی هۆش داوەتەوە... ئەم تەکنیکە (تەنها یەك کەسایەتی بە درێژایی رۆمانەکە بێ وەستان دەدوێ)[٢] رووداوو بەسەر هاتەکان بە شێوەیەکی پچڕ پچڕو ئاڵۆز دەگێڕێتەوە. ئەم جۆرە

[٢] گۆڤاری نووسەرانی نوێ ژ ٩ی نیسانی ١٩٩٩ ل ٥٥– ٥٧ (مۆنۆلۆژی ناوەوەی لەرۆمانی نوێدا) د. نعیم عکیە– وەرگێڕانی رێبین اسماعیل .

چیرۆکە لە گۆشەنیگای کەسێکەوە دەگێڕێتەوە واتە (مۆنۆفۆنیە)و هزرو بۆچوون و کاردانەوەو هەستی ئەو کەسە دەردەبڕێت و هەموو گێڕانەوەکە بریتییە لە (قسەکانی ناوەوەی ئەو کەسایەتیید)[٣] ئەم قسانەش زۆربەی جار شێواو و هەڵوەشاوەن و زیاتر لە ورێنە دەچن رووداوەکان لە دوای یەك پیشان نادرێن رۆمانی (شەپۆلی هۆش) لە بناغەدا گرنگی بەو لایەنە خەفەبووانەی هۆش و دەرەوەی مرۆڤ دەدات کە دەرناکەون و تەنها چاوی رۆمان نووسی دەیان بینێت یاخود هەستیان پێ دەکات و گرنگی بە دەروون و ناوەوەی شاکەس و هەست و نەستە خەفەکراوەکانی داوەو جەخت دەخاتە سەر ئاستەکانی پێش گوتن لە هۆشدا بە مەبەستی ئاشکرا کردنی گیانی دەروونی کەسیتیەکان بە تایبەتی شاکەس بەپێی چەمکی (میکائیل باختین) ئەم رۆمانە یا بڵێین چیرۆکە چیرۆکێکی مۆنۆلۆگییەو یەك کەس دەدوێت و قسەکردن بۆ خۆی قۆرخ دەکات و هەموو هەستە خەفەبووەکانی خۆی هەڵدەرێژێت. وەك رۆبرت همفری لە مەرجەکانی شەپۆلی هۆش و مۆنۆلۆگی ناوەوەی راستەوخۆیدا دیاری کردووە دەبێ (ئەوانی

[٣] گۆڤاری نووسەرانی نوێ –ژ٩ نیسانی ١٩٩٩– ل ٥٥– ٥٧ (مۆنۆلۆژی ناوەوەی ل رۆمانی نوێدا–د. نعیم عتیە– وەرگێڕانی رێبین رسول اسماعیل

لەدەروونداییە دەبێ بەلێشاوو بێ پەیوەندییەکی مەوزوعی توندیش لە نێوان ئەو شتانەدا نەبێ کە دەریان دەبرێ و قسەو باس و فیکرەیان زوو زوو یەکتر بقرتێنن)[1] لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کەلە مۆنۆلۆگی ناوەوەی راستەوخۆدا مەرجە بە لێشاوو هاتنی دەربڕین و یەکتری برین (یان نەبوونی پەیوەندی مەوزوعی)یش لە نێوانیاندا تێکەڵ بوونێك کە شەپۆلی هۆشە دروست دەکات)[2].

– لە هەندێ لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا مۆنۆلۆگی ناوەوە وەك شەپۆلی هۆش بەکار هێناوە کە بیرەکان بە لێشاو دێنن و زۆر جاریش پەیوەندییەکی لۆژیکی لە نێوان بیرەکاندا نییەو پچڕ پچڕی بابەتەکان ئاشکرای بە شەپۆلی هۆش دەکەن لە چیرۆکی (نامەی سەرنووسەر– ل١٧٣– ١٧٤) چیرۆکگێڕەوە لە گێڕانەوەدا بیرەکان بەسەر یەکدا تێکەڵ دەکات لە کاتێکدا نووسەر یان چیرۆکگێڕەوە (دڵی لای لاوە خوێن گەرمەکانە کە هەموو چەند هەفتەیەك بوو دەستیان دابووە تفەنگ...) یەکسەر بیرەکانی بۆ لای چەند کەسێکی تر دەڕوات و لە دڵی خۆیدا بە چاوی چیرۆکگێڕەوە شاکەس دەبینێ و کەسێکی دیاری کراوە دەڵێ:

[1] تيار الوعى فى الروايه الحديبه –رويرت همفرى– ص٤٤– ٤٩.

[2] لێکۆڵینەوە کورتە چیرۆکی کوردی .... ئیبراهیم قادر محەمەد.... ل ١٩٥.

"بيرم لە نەوزاد ئەكردەوە كە لە سەرەتای مەشقی چەكدایە یەكەم جار بوو تفەنگی ئەگرت بە دەستەوە... (فەرهادم) هاتەوە یاد لە ناو ریزی لاوەكانی هێزی بەرگریدا وەستا بوو سەری نەگەیشتە شانی هاورێكانی.... نازانم چۆن هەڵەی ناو نووسەكانی دایەرەی ناو نووسین بەفریای گەیشت كەبەهەژدە ساڵی نووسیبوو ل ١٧٣). لەلایەكی تریشەوە جارێكی تر بیرەكان بە لێشاو دێن وتێكەڵ بە یەك دەبن (جمهوریەتی كوردو عەرەب... تا... دوا...تن... وك... بەخ...ت... كورد... عە..رە...ب... ئەبێ خوشكە سۆڤیەتیەكانمان بەهاری كوردستانیان لا چۆن بێ؟! بە هەمەرەنگ دڵشادن...).

– لە چیرۆكی (پەیكەری گاورباغی ل ١٨٠)دا بیرەكان تێكەڵ دەبن چیرۆككگێرەوە پاش ئەوەی توانای (مولّلا) دەردەخات بە هۆی شەڵتە راكێشانی رێگای تسعین و بازارو دەست كورتی و دووركەوتنەوە بۆ رۆژانی رابردوو و نەوەكانی خەلیفە هەواس و پلاوە چەورەو چایە سەنگینەكەی مەولود لە پڕ بیرەكە پچڕ پچڕ دەبێ و بابەتێكی تری تێكەڵ دەكات و كەسیش حارز نییە (ئەمشەو خوا بە خێری بگێڕێ حاجی بەكر جەنابتم دی لە ناو گومەزی مزگەوتدا باڵت گرتەوە بەرەو ئاسمان ئەفڕیت... ماشاء الله... سەلاوات لە پێغەمبەر ئینشاء ئەڵلا پایەیەكی بەرزت پێ

بەخشراوە.. جا مەولودێکی پێغەمبەر بفەرموون بۆ ئەم جومعەیە).

- لە (سەر لە بەیانی نەورۆزێك) ل ۱۹۳دا چیرۆکنووس شەپۆلی هۆش بەکار هێناوە... نووسەر بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ هەستەکانی دەردەبڕێ.

- "ئەوسا ئازادو ئێستە گیرۆدەی سەد داو، ئەوسا کارەباو موبیلەو رادیۆو ئۆتۆمبیل و ئاوی بۆری، قاسپەی کەوەکان ئێستا لوولە تفەنگ و دەسڕێژی شەستیرو کەلەپچەو بگرەو بەردەی پۆلیس و زیندان، ئەوسا تافی لاوی و جوانی، ئێستا دەمی پڕی کە هەر ساتە خەفەتێك و هەر رۆژە دەردێك من لەم دەریا بێ پایانەی یادو لێکدانەوەدا بووم".

- لە چیرۆکی (بەسەرهاتی قوتابیەکی پۆلی چوارەمی حقوق ل۱۹۹)دا شەپۆلی هۆش بەکار هێناوە *.

- گێڕانەوەی مۆنۆلۆگی بەتەداعی

جۆرێکە لە مۆنۆلۆگی ناوەوە بە هۆی پشت بە یادو بیرەوەری و زانیارییەکانی زەین (الزهن) دەبەستێت بۆ وێنەو دەنگ و رەنگ و بۆن و بەرزی و نزمی)[1] ئەم جۆرە تەکنیکە لە چیرۆکی (سەر لە

* لەبەر زۆری نموونە بە پێویستمانی زانی ئاماژە بە لاپەرەکان بکرێ.

[1] لێکۆڵینەوەی کورتە چیرۆکی کوردی.... ل۱۹۹.

بەیانی نەورۆزێك)دا... ل ۱۸۸ لەگەڵ (بەسەر هاتی قوتابییەکی پۆلی چوارەمی حقوق- ل ۱۹۵)و (من و براکەم ل ۲۰٦) ئەم گێڕانەوە وەك دیارە پەیوەندی نێوان دوێنێ و ئەمڕۆیە واتە بە هۆی شتێکەوە شتێکی تر لە کاتی ئێستادا یاد دەکرێتەوە).

باسی دووەم:

هەندێ تەکنیکی تری گێڕانەوە

لە زۆربەی چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا چەند تەکنیکێکی گێڕانەوە هەن کە لە م خاڵانەی خوارەوە دەیانخەینە بەرچاو:

۱- چاپتەر کردنی چیرۆکێك و بەش بەش گێڕانەوەی یەکێکە لە تەکنیکە بەکار هێنراوەکانی گێڕانەوە[1] کە زۆرجار نووسەرێکی وەك شێخ مارف بەرزنجی لە هەندێ چیرۆکدا بۆ چاپتەر کردنی چیرۆکەکە ئەم نیشانەی داناوە.(* * *) یان (    ) یان ژمارە (یەکەم، دووەم، سێیەم، چوارەم)و زۆر جاریش ناونیشانی لاوەکی بۆ چیرۆکەکە داناوە لە چیرۆکی ئاوازو کەبابدا چیرۆکەکەی بەم شێوەیە چاپتەر کردووە.

[1] لێکۆڵینەوەی کورتە چیرۆکی کوردی لە کوردستانی باشووردا... ل ۱۸۰ (جێگەی سەرنجە شێخ مارف بەرزنجی لە نیوەی دووەمی پەنجاکانەوە ئەم جۆرە تەکنیکەی بەکار هێناوە کەچی (ئیبراهیم قادر) ئەم تەکنیکە بۆ زۆربەی نووسەرانی دەیەی حەفتای بەکارهێناوە، بڕوانە هەمان لاپەڕە ل۱۸۰.

١- بەكار هێنانی (* * *) بۆ هەر چاپتەرێك و نووساندنی بە چایتەرێكی تر.
٢- دانانی ناونیشانی لاوەكی بۆ چیرۆكەكە وەك:
أ/ لە ناو چایخانەی گەڕەكەكەدا.
ب/ بڕیاری دادگاو بەندیخانە.
٣- خەنجەر بۆ كەباب و تفەنگ بۆ ئاهەنگ.
- لە چیرۆكی (بەسەر هاتی قوتابییەكی پۆلی چوارەمی حقوق)[2]دا شێخ مارف بەرزنجی بۆ چاپتەركردنی ژمارەو بەشی داناوە وەك (بەشی یەكەم، بەشی دووەم، بەشی سێیەم، (پانسیۆن، بەشی چوارەم).
٢- هەواڵی رادیۆی كە زیاتر درێژە بە رووداوەكەو دڵنیا بوونی پاڵەوانی چیرۆك لە ناو زینداندا بە تایبەتی رووخاندنی هەستی پاڵەوان و بەرزكردنەوەی ورەی لە چیرۆكی (جەژنێكی شادی) لاپەڕە (٧) بەكار هاتووە. (هەواڵەكەی شەوم بیر كەوتەوە كە لە هەمان رادیۆوە بیستمان...).

(2) چیرۆكی بەسەرهاتی قوتابییەكی پۆلی چوارەمی حقوق.... ل ١٩٥- ٢٠٢.

(زۆرتر له رادیۆ که نزیك بوومەوه تا دڵنیا بووم که ئەم جارەش دەنگی دیموکراسی و ئاشتی باڵی خۆی کێشایەوه بەسەر شەقامەکانی بەغدای خۆشەویستدا).

٣- گەڕانەوه بۆ رابردوو -فلاش باگ و هێنانەپێش چاو.

ئەمەش جۆرێکە لە تەکنیکی گێڕانەوەی رووداوو گەڕانەوه بۆ یادێکی رابردوو رووداوێکی کۆن له ناو رووداوه سەرەکییەکەیدا (گەڕانەوه بۆ رابردووه واتای بیر خستنەوه)[1].

لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا ئەم جۆره تەکنیکە بە زۆری بەکار هاتووه وەك لە چیرۆکی (شەتڵ- ل ١٦٠- ١٦٦)و لە چیرۆکی (پەیکەرەکانی گاورباغی ل ١٨٠) لە چیرۆکی (سەر لەبەیانی نەورۆزێك ل ١٨٩، ل ١٩٠، ١٩١) کە ئەو گەڕانەوەیە بۆ رابردوو و هێنانی بۆ ئێستا بێ پچڕاندن کە زیاتر ژیانی کاراکتەر دەردەخات.

٤- تەکنیکی یەکدەنگی و فرەدەنگی (مۆنۆفۆنی و پۆلۆفۆنی)[2].

[1] الالسنیه والنقد الادبی -د. موریس ابو ناچر- بیروت ١٩٧٩- ص ٩٥.

[2] ئەم تەکنیکە لەلایەن رەخنەگر (میخائیل باختین) کراوه بە دوو جۆری سەرەکی و گێڕانەوەی یەك دەنگی زاراوەی گێڕانەوەی مۆنۆلۆگییەو یان مۆنۆفۆنیە... بەشەکەی تر فرد دەنگی کە زاراوه پۆلۆفۆنی و (الصوت الاخر- فاچل تامر... ص ٢٥).

زاراوەی مۆنۆفۆنی و پۆلۆفۆنی لە زاراوەی مۆسیقا وەرگیراون فۆن واتە دەنگ -مون واتە کەس یەکدەنگی. پۆلی واتای فره، فۆنی واتای دەنگ= فره دەنگی.

یەك دەنگی: ئەم تەکنیکە یەکێکە لە تەکنیکی گێڕانەوە کە چیرۆکگێڕەوە. لە گۆشەنیگای خۆیەوە ڕووداوەکان پێشکەش دەکات و دەیگێڕێتەوە بە تایبەتی لە چیرۆکی یەك دەنگیدا.

تەکنیکی فرەدەنگی (پۆلۆفۆنیە):- لە کۆمەڵی گۆشەنیگای چەند کەسانێکەوە بەسەر گێڕانەوەی یەکدەنگی زاڵە. چیرۆکگێڕەوە بە ئازادی لە نێوان دەنگەکان و ململانیدا دێت و دەچێت کەزیاتر زیندویەتی بە تێکستەکە دەدات. لە چیرۆکی یەکدەنگی – ئایدیۆلۆژیای تاکو یەك دەنگ دەور دەبینێ.

زۆرجار تەکنیکی یەکدەنگی پەیوەندی بە مۆنۆلۆگی ناوەوە و کەسێکی ئاوارەبوونی بێ پشت و پەنا دەکات.

لە تەکنیکی فرەدەنگیدا ڕەگەزەکانی گێڕانەوەو جۆرە جیاوازەکان و زمان و دەنگی کەسەکان و (بێگانەو ناو وەکو جۆرە ئاوازێکی سیمفونی تەواو وایە[3] کە هەر یەکێك دەورێکی تایبەتی و یەکێتی هارمونی پێکەوە بەستوویانەتەوە. هەرچی پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە بێ ئەوە مارف بەرزنجی ئاوڕی لە تەکنیکی یەکدەنگی لە چیرۆکی (نامەی سەر سنوور)

---

بڕوانە الموسیقی والحجارە– هوجولاینتتریت. ت: احمد حمدی محمود – القاهرە ١٩٦٤، س ٣٦.

هەروەها بڕوانە: الصوت الاخر –الجوهر الحواری للخگاب الوبی· فاچل پامر بغداد ١٩٩٢. ص ٢٠.

[3] الصوت الاخر. فاچل پامر.... ص٣١.

داوەتـەوە کـە شاکەس بـە دەسـت گەیـشتنی نامەو خوێندنـەوەی شاگەشـکە دەبـێ و ئاخ هەڵئەکێشێ و خۆزگە دەخـوازێ کـە بـاڵ بگرێتـەوەو زوو بگاتـە سـەر سـنوور بـۆ لای (م) و دەم بنێتـە نـاو دەمی و تێر تێر هەڵی مژێ، کە ئەمەش پەیوەنـدی بـە مۆنۆلـۆژی ناوەوە هەیە.

- هـەروەها لـە چـیرۆکی (سـەر لـە بـەیانی نـەورۆزێك)دا تـا کۆتـایی چـیرۆکەکە هەسـت بـە یـەك دەنـگ دەکـرێ کـە ئـەویش دەنگی چیرۆکگێڕەوە یا نووسەرەو لە کۆتاییدا دەنگـی کوڕەکـەی تێکەڵ دەبێ.

- لـە چیرۆکی (جـەژنێکی شـادی)دا هەسـت بـە گێڕانـەوەی یـەك دەنـگ دەکـرێ و چـیرۆکگێڕەوە رووداوەکـان دەگێڕێتـەوەو دەنگوباسـی دوێـنێ و ئـەمڕۆو گۆڕانکارییـەکان دەنگـی کەسـی لەگەڵ نییە تـەنیا کرێکارێك نـەبێ لـەپڕ دەردەکـەوێ (ئاخۆ چـی کەش ئەبینم) ئەم دەنگە لە گوێچکەی چیرۆکگێڕەوە دەزرنگایـەوە (چەند پاشاو میری کە بەرێ ئەکەن.. هەژاران زوو نامرن- نامرن) مۆنۆلۆژی ناوەوەی چیرۆکگێڕەوە دەردەخات.

لە تەکنیکی (فرە دەنگی)دا شێخ مارف بەرزنجی لەم چیرۆکانە ئاوڕی لە تەکنیکی فرەدەنگی کەسەکان داوەتەوە:

١- لە چیرۆکی (ئاوازو کەباب)دا بناغەیەکی (رەمز) بەکار هێناوە (خەنجەر بۆ کەباب و تفەنگ بۆ ئاواز).

٢- له چیرۆكی (گای پیرۆز) فرەدەنگەكان (شێخ، خەلیفە، كۆڵكە مەلا، كوێخا میوان، حەمەی مەیتەر، حەمە، قالە، حوسەین) ئەمانە هەریەكە دەنگ و رەنگ و شێوەزاری خۆیان بەكار هێناوەو دژی مامۆستای گوندەكەن.

٣- له چیرۆكی (پەیكەرەكانی گاورباغی)دا دوو دەنگ دیارە واتە (وسوو موڵلا)یە.

٤- له چیرۆكی (شەتڵ)دا دوو ئەفەندی واتە دوو مامۆستا دەور دەبینیٚ.

٥- له چیرۆكی (بەسەر هاتی قوتابییەكی پۆلی چوارەمی حقوق) چەند كەسێك دەور دەبینن. واتە جگە له چیرۆكگێڕەوەی هەمان شتزان هەندیٚ له كەسەكان دەبنە چیرۆكگێڕەوەو درێژە بە گێڕانەوە دەدەن ئەوەتا لەو كاتەی شاكەس بەرامبەر دانیشتووە بیر لە سەردەم و چۆنیەتی دەكاتەوە چیرۆكگێڕەوە واز لە گێڕانەوە دێنیٚ و بوار بە كەسەكە دەدات لە رێگەی گەڕانەوەی (فلاش باگ) چیرۆكەكە بگێڕێتەوە.. لە ناو ئەم چیرۆكانەدا كە فرە دەنگی لە جۆری كەسەكاندا دەردەكەویٚ یەكێك بزر دەبیٚ و یەكێكی نویٚ سەر هەڵدەدات (هەر یەكەشیان خاوەنی گۆشەنیگاو دەنگ و سەدای تایبەتی خۆیەتی)[1] كە ئەمەش

[1] الصوت الاخر -فاچل پامر- دار الشؤون الپقافیه العامه -بغداد ١٩٩٢- ص ٦٩.

مەرجێکی سەرەکی دروست بوونی پۆلیفنۆنیە. لەم چیرۆکەدا (کەمال) کە شاکەسە (عەزیز) عومەر، ام جرجیس جرجیسی کوڕی، سامان هەر یەکە بە جۆرو رەنگێك دەور دەبینن.

بەپێی رەخنەگری بەناوبانگی رووسی (میخائیل باختین) ئەم جۆرە تەکنیکە تازەیە (فرە دەنگی —پۆلۆفۆن) تەواوکەری جۆرە کۆنەکەیە (یەکدەنگی— مۆنۆلۆژی).

لە ناو چیرۆکەکاندا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە مارف بەرزنجی پتر ئاوڕی لە چیرۆکی فرەدەنگی وەك تەکنیکی تازە) داوەتەوە کە ئەمڕۆ سەردەمی ئەم جۆرە تەکنیکەیە.

٦- تەکنیکی هێنانە پێش چاو.

یەکێکە لە تەکنیکەکانی گێڕانەوە (کە رووداوی رابووردووی ژیانی کاراکتەر دەخاتە بەرچاوی خوێنەر. بەڵام جیاواز لە فلاش باگ بەوەی لەبری وەستاندنی گێڕانەوە لە کاتی ئێستای دەقداو گەڕانەوە بۆ رابردوو. رابردوو دەهێنرێت بۆ ئێستاو گێڕانەوە بەردەوامەو هەست بە پچڕاندن ناکرێ و خوێنەری لێ ئاگادار دەکرێتەوە، ئەو بەشەی رووداوەکانی ژیانی کاراکتەر کە دەهێنرێت بۆ ئێستای ناو چیرۆك، زنجیرەی گێڕانەوەی پێ تەواو دەکرێت[1] .

[1] لیکۆڵینەوەی کورتە چیرۆکی کوردی لە کوردستانی باشووردا... ل ١٨٨.

ئەم جۆرە تەکنیکە لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا بەدی دەکرێ وەك چیرۆکی (مەمەدە فەندی سەرسام) چیرۆکگێڕەوە لەسەر زاری مەمەدەفەندی رابردووی یاد دەکەوێتەوە بەراوردی ئێستای دەکات بێ پچڕانی دەقەکە مەمەدەفەندی بە بڵمە بڵم دەستی ئەکرد بە رازو گلەیی لەبەر خۆیەوەو لەگەڵ مورادا.

(کەسی جاران وابوو، چەقال و بەتال و کوردو کاراچ هەقی بوو بەسەر هاتووچۆی وەزیرو کاربەدەستانەوە... چۆن ئەبێ خەڵکی بیکەن بە رۆژی خۆیان.. چەند سوڵتان و پاشامان دی گشتی وامان نەدی، ئێستا شەڕو شکانیش بە دەست حکومەتەوە نەماوە دوو کەس ئەبێ بە هەرایان گورچ دوولاو قوڵیان ئەگرن یاڵلا بۆ لاوان.. جاران من قومسێتر بووم لە (قولغ) دائەنیشتم دوو باش چاوەش و چوار ئەفسەر هەموو کاروباری شاریان هەڵ ئەسووراندو کێ دەیوێرا فزە بکات..) جاران ئەمە نەبوو ـ لاوان، قوتابیان، ئافرەتان، کاوە، نەورۆز، گاورباغی، موزاهەرە..)[2]

ـ لە چیرۆکی (بەسەهاتی قوتابیەکی پۆلی چوارەمی حقوق)دا (کەمال) لەسەر کورسیەك دانشتبوو و لە لەحزەی ئێستادا بیر لە رابردوو دەکاتەوە دەیبەستێتەوە بە باری ئێستای.[3]

(2) سەرجەم بەرهەمی ... ل ٢١٢.

(3) سەرجەم بەرهەمی ... ل ١٩٥.

ـ له چیرۆکی (سەر لەبەیانی نەورۆزێك)دا له لاپەڕە (١٩٠، ١٩٣ ـ ١٩٤) نووســەر تــەکنیکی هێنانــەپێش چــاوی وەك تــەکنیکی گێڕانەوە هێنانەوەتە پێش چاو کە ژیانی کاراکتەرە رووداوەکانی ژیانی خۆی و رابردووی خۆی و گەل بۆ ئێستای دەهێنێت و زنجیرەی بیرەکانی پێ تەواو دەکات.

ئه نجام:-

لــه ئــهنجامی لێكۆڵینهوهكهمانــدا گهیــشتینه ئــهم خاڵانــهی خوارهوه:-

١- لــه نیــوهی دووهمــی ســاڵانی پــهنجادا، مــارف بــهرزنجی توانیویهتی چهند تهكنیكی گێڕانهوه بهكار بێنێ وهك شێوازێكی نـوێ لـه چـیرۆكهكانیدا سـێ جـۆره چـیرۆكگێڕهوه ههیـه لهگـهڵ جۆری بینین و شێوازی گێڕانهوهیان:-

أ) چیرۆكگێڕهوهی ههموو شت زان (چ. گ. ).

ب) چیرۆكگێڕهوهی ههمان شت زان (چ. گ. =).

ج) چیرۆكگێڕهوهی كهم شت زان. (چ. گ. د)

٢- لـهناو چـیرۆكهكاندا چـیرۆكگێڕهوهی هـهموو شـت زان زیـاتر بـهكارهاتووه گێڕانهوهكـهش زیـاتر بابهتییـه (وهك لـه خـشتهكهدا روومان كردۆتهوه).

٣- چهشنهكانی شێوازی گێڕانهوهكه:-

سهرجهم بهرههمی... ل٢١٢.

سهرجهم بهرههمی...ل١٩٥.

أ) راستهوخۆ

ب) ناراستهوخۆ

لەم دوو شێوازە چیرۆکنووس زیاتر شێوازی راستەوخۆ کە (بابەتی)یە لەناو چیرۆکەکاندا بەکارهاتووە (وەك لە خشتەکەدا روونمان کرۆدۆتەوە).

٤- بەپێی مەبەست و هۆیەکانی گێڕانەوە لە چیرۆکەکاندا (وەسف و گفتوگۆ) لەسەرجەم چیرۆکەکاندا کەم یا زۆر دەبینرێ.. لە وەسفەکانی ناو چیرۆکەکاندا گەیشتینە ئەوە کە مارف بەرزنجی پتر گرینگی بە وەسفی کەسەکان و لایەنی فیزێکی و وەسفی شوێنەکان داوە هەروەها لەرووی دایەلۆگەوە مارف بەرزنجی ئاوڕی زیاتر لە مۆنۆلۆگی ناوەوە داوەتەوە.. ئیتر ئەو مۆنۆلۆگە راستەوخۆ بێ یا ناراستەوخۆ بێ.

٥- لە چیرۆکەکاندا وەك تەکنیکی نوێ مارف بەرزنجی ئاوڕی لە تەکنیکی مۆنۆلۆگی (تەداعی) و شەپۆلی هۆش (تیار الوعی) داوەتەوە وەك لە چیرۆکەکانی (سەر لەبەیانی نەورۆزێك) و (نامەی سەر سنووری، پەیکەرەکەی گاورباغی.. هتد) داوەتەوە.

٦- بەکارهێنانی تەکنێکی تر وەك یەلایەنێکی نوێکردنەوەی چیرۆك مارف بەرزنجی یەکەم چیرۆکنووس بووە کە لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا توانی (چاپتەرکردنی چیرۆك) بەکاربهێنی و بەش بەشی هەندێ لە چیرۆکەکانی بکات و نیشانەی (* * *) بۆ دابنێ وەك لە چیرۆکی (ئاواز و کەباب)دا ئەم تەکنیکەی بەکارهێناوە.

هەروەها لە چیرۆکی (بەسەرهاتی قوتابییەکی پۆلی چوارەمی حقوق)دا تەکنیکی بەش بەشکردنی بەم جۆرە بەکارهێناوە (بەشی یەکەم، بەشی دووەم، بەشی سێیەم، بەشی چوارەم).

٧- لە هەندێ چیرۆکدا مارف بەرزنجی تەکنیکی (هەواڵی رادیۆی) بەکارهێناوە چیرۆکی (جەژنێکی شادی).

٨- مارف بەرزنجی لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا تەکنیکی گەڕانەوە بۆ رابردوو (فلاش باك) و تەکنیکی (هێنانە پێش چاوی) بە کارهێناوە وەك لە چیرۆکی (شەتڵ - پەیکەرەکەی گاورباغی - سەر لەبەیانی نەورۆزێك - مەمەدەفەندی سەرسام - بە سەرهاتی قوتابییەکی پۆلی چوارەمی حقوق).

٩- مارف بەرزنجی لە چیرۆکەکانیدا توانی تەکنیکی نوێ بەکار بێنێ کە ئەویش.

أ) تەکنیکی یەکدەنگی (مۆنۆلۆگی).

ب) تەکنیکی فرەدەنگی (پۆلۆفۆنی).

لە ئەنجامدا بۆمان دەرکەوت کە تەکنیکی فرەدەنگی وەك تەکنیکی چیرۆك و رۆمانی هاوچەرخ بە زۆری لای مارف بەرزنجی بەکار هاتووە. چیرۆك (شەتڵ، ئاوازو کەباب، گای پیرۆز، پەیکەرەکەی گاورباغی، بەسەرهاتی قوتابییەکی...، سەر لەبەیانی نەورۆزێك).

سەرچاوەکان:

أ) بەزمانی کوردی:-

١- ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا (١٩٢٥ - ١٩٧٠) سەباحی غالب - بەغدا ١٩٧٨.

٢- بیلوگرافیای دوو سەد ساڵەی کتێبی کوردی (١٧٨٧ - ١٩٨٦) مستەفا نەریمان - بەغدا ١٩٨٨.

٣- بینای هونەری چیرۆکی کوردی لەسەرەتاوە تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان - پەرێز سابر محمد (نامەی ماجستێر) کولیجی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر ١٩٩٣.

٤- پەخشانی کوردی - عەبدولرەزاق بیمار - بەغدا ١٩٨٨.

٥- چیرۆکی هونەری کوردی (١٩٢٥- ١٩٦٠) حسین عارف- بەغدا ١٩٧٧.

٦- چیرۆکی نوێی کوردی -حەسەن جاف- بەغدا ١٩٨٥.

٧- لێکۆڵینەوە لە چیرۆکەکانی حسین عارف -تاهر محەمەد عەلی (نامەی ماجستێر) کۆلیجی ئاداب- زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر ١٩٩١.

٨- لێکۆڵینەوەو بیلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٩، عومەر مەعروف بەرزنجی- بەغدا ١٩٧٨.

٩- لێکۆڵینەوەی هونەری یان هەڵبزرکاندن. عومەر مەعروف بەرزنجی... بەغدا ١٩٧٨.

١٠- رۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا. هیمداد حسین- هەولێر ١٩٩٨.
١١- سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید (پشکۆ). سامان مارف بەرزنجی- عومەری مەعروف بەرزنجی- هەولێر ١٩٩٣.
١٢- کرێکارو چیرۆکی کوردی -رووف حەسەن- بەغدا ١٩٨٢.
١٣- لێکۆڵینەوەی کورتە چیرۆکی کوردی لە کوردستانی باشووردا (١٩٧٠-١٩٨٠) ئیبراهیم قادر محەمەد هەولێر ١٩٩٧ (نامەی دکتۆرا)

**بە زمانی عەرەبی:**

١- الالنسية والنقد الادبي في النظرية والممارسة. د. موريس ابو ناضر -بيروت ١٩٧٩.
٢- البناء الفني لرواية الحرب في العراق -عبدالله ابراهيم علاوي (رسالة ماجستير) جامعة بغداد- بغداد ١٩٨٧.
٣- بناء الرواية -د. سيزار قاسم- بيروت ١٩٨٥.
٤- البناء الفني في الرواية العربية في العراق- شماع مسلم و د.نعيم العاني -بغداد- ١٩٨٧.
٥- البناء الفني في الرواية التاريخية العربية -خالد سهر محي الدين الساعد( ؟ ).
٦- الادب و فنونه -د. عزالدين اسماعيل -القاهرة- ١٩٨٧.

٧- النقد التطبيقي التحليلي -د.عدنان خالد عبدالله. بغداد ١٩٨٦.

٨- الصوت الاخر- الجوهر الحواري للخطاب الادبي، فاضل ثامر- بغداد ١٩٩٢.

٩- القصة القصيرة نظريا وتطبيق -يوسف الشاروني- سلسلة كتاب الهلال- العدد ٢١٦- مصر ١٩٧٧.

١٠- الواقعية في الادب الكردي -د. عزالدين مصطفى رسول- بيروت ١٩٦٦.

١١- تيار الوعي في الرواية الحديثة -روبرت همفري- ت، د. محمود الربيعي ط ٢ مصر ١٩٧٥.

١٢- تقنيات السرد الروائي في ضوء المنهج البنوي -يمنى العيد. لبنان ١٩٩٠.

١٣- صفحات من تاريخ العراق المعاصر -درات تحليلية بغداد ١٩٨٧.

١٤- عالم القصة -برناردي فوتور. ت: د. محمود مصطفى هدارة. القاهرة ١٩٦١.

١٥- عالم الرواية- رولان بورنوف و ديال ئوتوليش - ت نهاد التكرلي- بغداد ١٩٩١.

١٦- فن القصة- د. محمد يوسف نجم- بيروت ط٦، ١٩٧٤.

١٧- فن القصة القصيرة - د. رشاد رشيد - بيروت ط٢ ١٩٧٥.

١٨- نظرية المنهج الشكلي- توماشفسكي الشكلانين الروسي ترجمة -ابراهيم الخطيب- بيروت ١٩٨٢.
١٩- نشأة القصة في العراق ١٩٠٨- ١٩٣٢- د. عبدالاله احمد - بغداد ١٩٦٩.
٢٠- الموسيقي والحضارة - هوجولايني تنتريت. ت-احمد حمدي محمود- القاهرة ١٩٦٤.

## گۆڤارو رۆژنامەكان:

### گۆڤارەكان:

١- بەيان ژ٤ بەغدا ١٩٧٤ (چیرۆك لە ویژەی كۆن و نویماندا- عبدالله سراج)
٢- بیری نویٚ ژ ٦٤- ١٢/٩/١٩٧٣. ژ ٦٤- ١٢/٩/١٩٧٣
٣- رۆژی كوردستان ژ ١ سالّی ٢ ئابی ١٩٧٤ (پشكۆو چیرۆكی كوردی).
٤- رۆشنبیری نویٚ ژ ٦٣ بەغدا ١٩٧٧ (شیوەكانی تەكنیك لە چیرۆكی سالآنی دوای ١٩٧٠- حسین عارف)
٥- شەفەق ژ٢- ١٥ی شوباتی ١٩٥٨- ئەلف و بیٚ- شوان.
٦- شەفەق -ژ١ ١٥ی كانونی دووەم ١٩٥٨ (كامەران و دیاریەكەی).

٧- شەفەق- ژ ١٠ بەرگی یەك، ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٥٨- كۆن و نویێ لە شیعرا...)

٨- شەفەق -ژ ٢- ٢ كانونی دووەم و شوبات ١٩٥٩ (ئەلف و بێ)

٩- نووسەری كورد -ژ ٦ ساڵی ١- مارت و نیسان ١٩٧٢.

١٠- نووسەری كورد- ژ٨ مایسی ١٩٧٣ (پشكۆو رەخنەی ئەدەبی).

١١- نووسەرانی نویێ - ژ٩ نیسانی ١٩٩٩.

رۆژنامەكان:

١- التاخی- العدد ١٣٧- ١٤ ایلول ١٩٧٢ (پشكۆ و القصه الكردیه).

٢- التاخی -العدد ١٢٠٠- ٣٠ تشرین ١٩٧٢. (      ).



٣. سڵاو له حه‌یده‌ربابا ـ وه‌رگێڕای کوردی شیعرێکی به‌رزی محمد حسین شه‌هریار شاعیری ناسراوی ئازه‌ربایجانی، وه‌رگێڕان له ئازه‌ربایجانییه‌وه به هاوکاری حه‌سه‌ن ئه‌یبووبزاده.

**کاره‌کانی تر**

١. "کاچوو مادانی"- کۆی بیره‌وه‌رییه‌کانم.

٢. راپه‌ڕینی شێخ عوبه‌یدیڵڵای شه‌مزینی- کۆمه‌ڵه یادداشتی رۆژانه‌ی میرزا عه‌لی ئه‌فشاری ئوورومی، ده‌ستنووسێکی فارسی.

٣. خرۆشۆف و که‌مپه‌ینی دژی ستالینی، نووسینی کاتی مه‌جید، وه‌رگێڕان له‌ئینگلیزییه‌وه.

٤. وه‌رگێڕانی ١٢ کتێبی منداڵان به کوردی و ٥ کتێبی تر به فارسی بۆ بنکه‌ی (مانترا) له له‌نده‌ن. ئه‌م کتێبانه که هه‌ندێکیان تائێستا بڵاوکراونه‌ته‌وه به دوو زمان چاپ ده‌بن: ئینگلیزی و کوردی یا ئینگلیزی و فارسی.